6



# خۆری ئیسلام

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری زانستی ئیسلامی وەرزییە

وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی دەری دەکات

شەوالی ـ ١٤٢٠کوچی ـ بەفرانبار ـ ڕێبەندان / ٢٦٩٩ کوردی ـ کانوونی دووەمی / ٢٠٠٠ زاینی

# ناوەرۆك



کردنەوەی (بەشی راگەیاندن)

## لەپەیمانگای تەکنیکی هەولێر

# خەونێکی مەزن و لەمێژینەی رۆژنامەنووسان بوو هاتە دی

حەمە ئەحمەد جاف

دوا بەدوای راگەیاندنی بڕیاری کردنەوەی بەشی راگەیاندن و رۆژنامەگەری لەکۆلێژو پەیمانگای تەکنیکیدا، کەلەچوار چێوەی یاداشتێ پێشنیارێکی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستاند پێشکەش بەسەرۆکایەتی زانکۆو ئەنجومەنی فێرکردنو خوێندنی بالا لە پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێم کرابوو، رۆژی ۱۹۹۹/۱۱/۸ فرمانی کردنەوەی دراو دەستەی پەیمانگا تەکنیکییەکانو ئەنجوومەنی فێر کردنی بالاش گفتوگۆو کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی تایبەت بەشێوازو جۆری کردنەوەی ئەو بەشە گرنگەی راگەیاندن لەپەیمانگادا سازدا سەبارەت بەچۆنیەتی وەرگرتنی قوتابیان لەوبەشەدا کەبڕیاردرا کە شێوازو جۆری وەرگرتنی قوتابیان بەپێی چەند مەرجێکی بنەڕەتی و دیاریکراو، پیادە بکرێ، پاش ئەوە، دەستکرا بەوەرگرتنی قوتابیان لەبەشی راگەیاندنو رۆژنامەگەری لەپەیمانگای تەکنیکی هەولێری پایتەختدا، هەڵبەت مەرجەسەرەکیەکانی وەرگرتنی قوتابیانیش بەم شێوەیە بەرجەستەکرا لەوانە: سەرجەم ئەو دەرچووانەی کەئێستا لە دەزگاو کەناڵەکانی راگەیاندن لەهەرێمدا کار دەکەن دەگرێتەوە، ئەمەش بەومەرجەی هەلگری یەکێك لەبڕوانامەکانی هەردوو قۆناغی (زانستی یان وێژەیی) یاخود هەر بڕوانامەیەکی دیکەی ئامادەیی بێت هاوپێچ لەگەڵ نوسراوێکی رەسمی رەزامەندی ئەو کەناڵو دەزگایەبێت کەهەلگری یەك لەوبڕوانامانە کاری تێدا دەکات، هاوکات (کۆنمرە)و (ساڵی دەرچوون)و (رازەی خزمەت وتەمەنی لەو دەزگایە)دا رەچاو دەکرێ دووەم مەرجی سەرەکی وەرگرتنی قوتابیانیش لەوبەشەدا،وەرگرتنی ئەو قوتابیانەیە کە دەرچووی ئەمساڵی خوێندنن وئێستا لە کۆلێژو پەیمانگاکانی کوردستان وەرگیراون هەڵبەت ئەوانیش دەتوانن لەرێگای (دابەزین) بۆیو بەگوێرەی ریزبەندی (کۆ نمرە)کانیان وەربگیرێن. هەروەك لە لێدوانێکی تایبەتی بەرێز (فازڵ نەبی عوسمان) راگری پەیمانگای تەکنیکی هەولێروا هاتووە کەلە رۆژی ۱۹۹۹/۱۱/۱۳ تا ۱۹۹۹/۱۱/۱۸ بنکەی وەرگرتنی پەیمانگای ناوبراو، دەستی بەوەرگرتنی قوتابیانی پابەندی ئەو مەرجانە کردو خوێندن تیایدا دەستی پێ کرد.. بەڵێ.. کردنەوەی ئەوبەشە گرنگەی رۆژنامەگەری لەفەرهەنگی



خوێندنی باڵاو مێژووی بزافی رۆشنبیری وراگەیاندنی کوردستاندا رۆڵێکی کاریگەرو بەرچاو دەگێرێ لە خزمەتکردن بەرەوتی کاروانی بزافی رۆژنامەوانی کوردیمان وهاوکات یەکێکە لەبنەماو پرەنسیپە گرنگەکانی کۆمەڵگای کوردەواری لەپێش خستنی ئەم رەوش و ئەزموونە دیموکراتیەی کەلەکەمان کە لەچاوگی راپەرین و دەسکەوتە بەنرخ و بە(بەها)کانی پەرلەمانی هەڵبژێردراوی کوردو حکومەتی کوردستاندا، سەرچاوەی گرتووەو هاوکات هەوێنی رەنج و خەبات و خوێنی شەهیدانی سەربەرزی نەتەوەکەمان بوو، هاتە دی، کەدەمێك بوو خەونی پێوە دەبیندرا، نکۆڵی لێ ناکرێ، کردنەوەی ئەو بەشە گرنگ و پر بایەخەی راگەیاندن لەپەیمانگایەکی تەکنیکی کوردستاندا، هاتنەدی خەونی قووڵ و لەمێژینەی قوتابیانی ئارەزوومەندو رۆژنامەنووسانی کورد بوو، لەپێناو زیاتر خزمەتکردن بەو بزاوتە ئیعلامی و رۆشنبیرییەی کەئێستا لەکوردستاندا پیادەیە، بەمەبەستی گەیاندن و بلاوکردنەوەی دەنگ و رەنگی هەواڵ و چالاکی و رووداوەگەرمەکانی هەرێمی کوردستان بە جیهانی ئیقلیمی و دەرەوەی کوردستان و ئاشناکردنی ئەزموونەکەمان بەجیهان و بەنێو نەتەوەیی کردنی دۆزە رەواکەمان لەچوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا، کەلەفیدراڵی کوردستاندا خۆی دەبینێتەوە، ئەمرۆ ئێمەش وەك ئەرکێکی پیرۆزی نیشتمانی و نەتەوەیی، وێرای دەربرینی هەست و سۆزو خۆشەویستی و پیرۆزبایمان سەبارەت بەکردنەوەی ئەوبەشە، جارێکی تر بەناوی بەرێز سەرنووسەرو دەستەی نووسەرانی گۆڤاری خۆری ئیسلام و کارمەندانی نووسینگەی راگەیاندنی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان و سەرجەم نووسەران و خوێنەرانی موسڵمانی گۆڤارەکەمانەوە، جوانترین چەپکە گوڵی پیرۆزبایی ئاراستەی بەڕێزان پەرلەمان و حکومەتی کوردستان و ئەنجومەنی فێرکردن وخوێندنی باڵاو سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین ودەستەی پەیمانگا تەکنیکییەکان بەگشتی و راگرایەتی پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەکەین بەبۆنەی جێبەجێ کردنی ئەو بریارە گرنگ و پیرۆزەی رۆژی ١٩٩٩/١١/٨ (ئەنجومەنی فێرکردنی باڵا) لەکردنەوەی (بەشی راگەیاندن) لەپەیمانگای تەکنیکی هەولێردا بەمەبەستی زیاتر خزمەتکردنی بەرەوتی مێژووی رۆژنامەنووسی کوردیمان وپێشخستنی رەوشی راگەیاندن لەهەرێمی کوردستاندا ئەنجام درا، لەکۆتاییدا وێرای دووپات کردنەوەی جوانترین پیرۆزباییمان دەڵێین:

*** پێکەوە بەرەو سەرکەوتنی ئەو ئەزموونە تازەیەی بواری راگەیاندن و رۆژنامەنووسی کوردی لەکوردستاندا.**

*** پیرۆز بێت ئەو هەنگاوە بەبایەخ و پیرۆزەی ئەنجومەنی فێرکردنی باڵا لەکردنەوەی ئەو بەشە گرنگەی راگەیاندن لە پەیمانگای تەکنیکی هەولێری پایتەخت.**

*** جوانترین پیرۆزباییش بۆ مامۆستایان و قوتابیانی ئارەزوومەندی ئەو بەشەو هیوای بەردەوامی ئەوبەشەو سەرکەوتنیان بۆ دەخوازین.**





# لەیادی ٥١ مینساڵرۆژی ڕاگەیاندنی جاڕی جیهانی مافی مرۆڤدا

سەربەست کەریم پشدەری

جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ یەکێکە لە پرۆسەپیادەکراوەکانی ئەو یاداشتو بەڵگەنامە ئەخلاقیو یاساییانەی لەڕەوتی کاروانی مێژووی بەرەو پێشەوە چوونی مرۆڤدا بەرجەستە بووەو خۆی لەجێبەجێکردنی ئەو بەندانەی ڕێ لەپێشلکردنی مافە دواکانی مرۆڤ دەگرێت، دەنوێنێ. هاوکات ڕاگەیاندنی جاڕی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لەساڵی ١٩٤٨،دا تێگەیشتنی هاوبەشی کۆمەڵو کۆمەڵگای نێو نەتەوەیی جیهانییە لە بەرامبەر خولقاندنی ترسناکترین کاری نارەوایی مرۆیی لەجیهاندا، هەڵبەتە ڕاگەیاندنی ئەو جاڕەش لەجیهاندا، فاکتەرێکی پۆزەتیڤانەی گرنگو مەزن بوو لە پێناوی دابینکردنی مافی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی مرۆڤو پارێزگاریو داکۆکی لێکردنیان، شایانی باسە، جاڕی جیهانی مافی مرۆڤ لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، دەرچووەو بۆتە ڕێنماییو ڕاسپاردەی جێگرو نەگۆڕی گشت دەستوورو یاسا ناوخۆییەکانی وڵاتانی جیهان، ئەمە وێڕای سیستەمە سیاسیو ئابووریو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ لەهەموو قۆناغەکانی ژیاندا. نکۆڵی لێ ناکرێت جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ هەر لەسەر شێوازە تەقلیدییەکەی پێشووی خۆی نەوەستا بگرە گەیشتە ئەو ئاستەی کە لە چەسپاندنی یاسا ناوخۆییەکانی وڵاتاندا خۆی بینییەوە بۆ بەڵگەش ئێستا ئەو یاسایە گەیشتۆتە ئاستێك کە لە هەردوو ڕێککەوتننامەی نێو دەوڵەتی مافی ڕامیاریو مەدەنی و ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی پرۆتۆکۆڵە سەربەستەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. شایانی باسە، یەکێك لەپێشکەوتنی ڕێککەوتننامەکانی مافی مرۆڤ، زەمانەتی مێژوویی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤە. کەلەپێکهێنانی لیژنەکانی مافی مرۆڤو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤو ڕێکخراوی لێبوردنی گشتی نێو دەوڵەتی لەبواری کارو چاودێری کۆمەڵایەتی و تەندروستیو زانستو فێرکردنو فەرهەنگی دەردەکەوێ. ئەمەو جاڕی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لەو چەندانەی دواییدا پێشکەوتنێکی دیکەی نەوعی ومەوزوعی بەخۆیە وەگرت ئەویش کردنەوەی دەروازەیەکی دیکەی بەرفراوان بوو لەبەردەم بنبڕکردنی زیاتری پێشیلکارییەکانی ماف مرۆڤ لەجیهان بەگشتیو لە کوردستان بەتایبەتی ئەمەو لەدوای ڕاپەڕینو کۆڕەوە ملیۆنییەکەی کوردو پەیڕەوکردنی سیاسەتی جینۆسایدو قڕکردنی مرۆڤی کورد لە لایەن ڕژێمەیەك لەدوا یەکەکانی عێراقو زێتر بوونی ئێشو ئازارەکانی مرۆڤی کورد گەیشتە ئەو ئاستەی کە سەرجەم پێشیلکارییەکان دژ بە مافە سیاسیو ڕۆشنبیریو نەتەوایەتی لەلایەن ئەو ڕژێمانەی ئەو سای عێراق کە حوکمی کوردستانیان لە جڵەودابوو، جیهانی هەژاندو ئەو گۆمی بێ دەنگییە شڵەقێنراکە ساڵانێکی دوورو درێژ بوو (مرۆڤی کورد مافی پێشێل دەکرا..) هاوکات ئەمەش ئاسۆیەکی بەرفراوانتری خستە بەردەم کۆمەڵەی نێو دەوڵەتی لە زووتر جێبەجێکردنی بەندەکانی مافی مرۆڤدا، هەڵبەت ئێمەی کوردیش یەکێکین لەو گەلە بن دەستانەی کەلەژێر هەڵستو پێخووسنتی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤدا، دەناڵێنین، بۆیە لێرەدا وێڕای ڕێزو پیرۆزباییمان بۆ بیرەوەری (٥١)مین ساڵیادی ڕاگەیاندنی جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ، دەڵێین/ خۆزگە بڕیاری (٦٨٨)ی نێو دەوڵەتی کە تایبەتە بە دیاری کردنی هێڵەکانی پشتێنەی ئەمنیو هەلگرتنی پێشێلکارییەکانی ڕژێمو بنبڕکردنی سیاسەتی ئەنفالو قڕکردنی مرۆڤ کوردو چەوساندنەوەی گەلانی عێراق، دەبووبە یەکێك لەبەندەکانی جاڕی جیهانی مافی مرۆڤو بە تەواوی جێبەجێ دەکراو (ڕژێم)ناچار دەکرا، دەست لەوسیاسەتە شۆڤێنیانەی هەلگرێ، بۆ ئەوەی میللەتی ئێمەش لەسای پەرلەمانو حکومەتی دیموکراتی فیدراڵی کوردیدا، لەکلاورۆژنەی چەسپاندنی یاساو مافی مرۆڤەوە ڕەوڕەوەی مێژووی تەمەنی پڕشکۆی سیاسیو فەرهەنگیو نەتەوەیی خۆی باژوێ.

*** پێکەوە.. بەرەو باشترو چاکتر جێبەجێکردنو چەسپاندنی بەندەکانی جاڕی جیهانی گەردوونی مافی مرۆڤ بەگشتیو مافی مرۆڤی کورد بەتایبەتی.**

*** جارێکیتر جوانترین پیرۆزباییمان بۆ پەنجاو یەکەمین ساڵیادی ڕاگەیاندنی جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ لەجیهاندا.**



# مەلا عەبدولڕەحمان پێنجوێنی ناسراو بە(مەلای گەورە)

## ١٨٢٤ز-١٨٩٩ز ١٢٤٤ک-١٣١٩ک

عوسمان حەسەن جەلال

شاری پێنجوێن یەكێكە لەشارە دێرینەكانی كوردستان، چەندین رای جۆراوجۆر سەبارەت بەبنیاتنانی هەیە، كۆمەڵێك رایان وایە كە بەسەردەمی سۆمەرییەكانەوە دروست كراوە. كۆمەڵێكی كە بەسەردەمی بابلییەكانی دەزانن. بەهەرحاڵ راوبۆچوونی جیاواز هەیە لەچاو هەڵهێنانی ئەم شارە بەدنیای شارستانیەت و مێژوو. شوێنەوارە بەناوبانگەكانی بەڵگە نەویستن كە ناوچەیەكی ستراتیجی و بایەخدار بووە لەهەموو بوارەكاندا، دیارە شارێكی وا مێژوویی هەر لەسەرەتاوە خەڵكانێكی دەركەوتوو ناویان لەگەڵ گەورە بوون و پێشكەوتنی شارەكەدا هاتووە بەپێی رێچكەی سەردەم لەگەڵیدا رۆیشتوون كەلە پیاوانی ئەم شارە شۆرشگێرە كەسایەتی ئایینی و كۆمەڵایەتی كلیلی دەرگای زانست و سەرفرازی ناوچەكە خوالێخۆشبوو(مەلا عەبدولڕەحمان) پێنجوێنی بووە لەبەر گرنگی باسەكە پێمان چاكە لەم چەند دێرەی خوارەوەدا ژیانی ئەو زانا پایە بەرزە روون بكەینەوە.

ناوی مەلا عەبدولڕەحمان كوڕی مەلا محەمەدی كوڕی مەلا ئیبراهیمی كوڕی مەلا عەلی كوڕی مەلا یوسفی كوڕی مەلا عەبدولكەریمی كوڕی سید حەمادە تاشێخ نوردینی بریفكانی هەموویان سەیدو مەلا بوون بەڵام لەبەر ئەوەی پێنجوێنی شەیدای زانست بووە بەهەموو بەشەكانیەوە، وای راگەیاندووە كە خەڵكی بەماموستا ناوی بهێنن لەجیاتی سەید هەر لەبەر ئەم هۆیەش بووە كەپێنجوێنی شاڵی سەوزی نەبەستووە.

مەلا عەبدولڕەحمان پێنجوێنی لەساڵی ١٨٢٤ لەخێزانێكی ئایینی ناودار لەپێنجوێن لەدایك بووە، ساڵی ١٨٩٩پاش ٧٥ ساڵ تەمەن كاتژمێر سێی شەوی هەینی مانگی(ذو القعدة) لەپێنجوێن كۆچی دوایی كردووە. لەژوورێكی مزگەوتەكەی خۆیدا( كە ئێستا بەمزگەوتی پاشا ناسراوە) بەخاك سپێردراوە.

سەرەتای خوێندنی ئەم زانایە لەقوتابخانەكەی باوكییەوە دەست پێدەكات لەپێنجوێن كەلەزۆربەی ناوچەكانی كوردستانەوە خەڵكی روویان كردۆتە ئەم قوتابخانەیە بۆ خوێندن. سەرەتای خوێندنی بەتەواو كردنی قورئانی پیرۆز پاشان خوێندنی كتێبی سەعدوڵای گەورە لەگەڵ چەند نامیلكەیەكی بچووك، بەمەبەستی وەدەست هێنانی خوێندنی تەواو دەست بەگەڕان دەكات بەهەموو ناوچەكانی كوردستاندا.سەرەتا لەشاری سلێمانی لای هەردوو زانای پایە بەرز مەلا عەبدولقادریی شێخەڵمارێنی و مەلا ئەحمەدی مفتی ناسراو بەچاومار كتێبی شەرحی جامی و حاشیەكانی عەبدولغەفور لاری و عصام الدين دەخوێنێ لەگەڵ خوێندنی كتێبی(الرسائل النطقیة). ئەوەندە بەتواناو چالاك دەبێت لەقوتابخانەكانی سلێمانیدا لەچەندین كۆڕی زانستی ئایینیدا ناوی وەك قوتابیەكی هەڵكەوتوو دەردەكەوێت. بۆ درێژە دان بەزانستە قورئانیەكان روو دەكاتە شاری سنە، كتێبی حاشیەی عەبدوڵلا یەزدی و كتێبی(اداب البحث) لای مەلا محەمەد ناسراو بە(فخر العلماء)دەخوێنێت.لەوێوە روو دەكاتە(تۆرجان) لەموكریان كتێبی(شرحی شەمسیەی مەتالیعی) دەخوێنێت لای زانای بەناوبانگ(مەلا عەلی قزڵچی) دواتر دەگەڕێتەوە ناوچەی هەورامان لای مەلا ئەحمەدی نۆویشەیی عیلمی(هەیئەت. كەلام) دەخوێنێت لەوێوە بۆ تەواوكردنی خوێندن روو دەكاتە شارۆچكەی رەواندوز. دەستی كردووە بەخوێندنی فەلەكیات لەگەڵ كتێبی(شرح الافلاك الچقمینی) لای زانای ئایینی ناودار(مەلا عمر خێلانی) دواتر جارێكیتر دەگەڕێتەوە (تورجان) دیسانەوە لای مەلا عەلی قزڵچی



ریازیات دەخوێنێت لەگەڵ(بەیان و بەدیع) لەسەر دەستی مامۆستا عەلی قزڵچی بڕوانامەی زانستی ئایینی پێدەدرێت و دەگەڕێتەوە بۆ پێنجوێن. لێرەوە وەك قازییەکی شارەزا وەك رابەری قوتابخانەیەکی ئایینی لەسەرتاسەری کوردستاندا دەناسرێت کەزانایان لەهەموو لایەکەوە بەبەردەوامی سەردانی دەکەن. مێژوو نووسی خوالێخۆشبوو(ئەمین زەکی) دەڵێت پێنجوێنی لەتەمەنی(٤٠) ساڵیدا بۆ تەدریس لەپێنجوێنەوە رووودەکاتە سلێمانی و ماوەی(١٥) ساڵ لەمزگەوتی گەورە مودەریس بووەو دەیان زانای بەتوانا لەقوتابخانەکەیدا پێگەییون و بڕوانامەی زانستی قورئانیان وەرگرتووە، لەوانە مەلا رەشید بەگی بابان دانەری(اقتران النیرین). مەلا حسەینی پیسکەنی، مەلا سەعیدی ئاغجەلەری، مەلا عەبدولڕەحمان سەلەسی، مەلا عزیز دەرەتفێیی، سەعیدی سهیلی کە مفتی شاری کفری بووە، دوای مانەوەی(١٥) ساڵ لەسلێمانی لەسەر داواو زۆرلێکردنی خەڵکی پێنجوێن لەقوتابخانە ئایینییەکەی دەست دەکاتەوە بەتەدریس ئیتر هەموو ژیانی تەرخان دەکات بۆ خواناسی کە لەو بوارەشدا بەزانایەکی زۆر(زاهد) ناسراوە، بەشانازییەوە لەزانکۆی ئەزهەر لەگەڵ زانکۆکانی سعودیە چەندین مسانیلی شەرعی پێنجوێنی دەخوێنرێ. ئەم هەواڵانە چەندین جار پێمان گەیشتووە لەلایەن ئەو بەڕێزانەی کەسەردانی ئەو زانکۆیانە دەکەن. کتێبخانەکەی پێنجوێنی هەتا ساڵانی(١٩٨٠) لەلای ئێمە لەپێنجوێن پارێزگاری لێکرابوو مابووەوە، بەڵام لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی عێراق- ئێران و کاولکردنی شاری پێنجوێن کتێبخانەکەش بووە خۆراکی ئەو کاولکارییەو بووە هۆی تیاچوونی( ٥ کتێبی دەست نووسی پێنجوێنی لەگەڵ ٤٠٠ کتێبی ئایینی). لەساڵانی(١٩٧٠)کاندا خوالێخۆشبوو مامۆستا(کامەران موکری) لەگەڵ چەند برادەرێك سەردانیان کردین بۆ پێنجوێن کە کتێبخانەکەی پێنجوێنییان بینی سەرسام بوون(مامۆستا کامەران ئەوکاتە سەرۆکی کتێبخانەی زانکۆی سلێمانی بوو)، داوای دەست نووسەکانی کرد لەباوکم کەبیانبات لەسەر حسابی زانکۆ چاپیان بکات. بەلام بەداخەوە باوکم فەرمووی لێرە چەند دەمێنینەوەو کاری لەسەر دەکەن

ماڵی خۆتانە. بەڵام رەزامەند نیم ئەو کتێبانە بچنە دەرەوە چونکە خۆمان چاوەڕوانی ئەوەین رۆژێك بتوانین چاپیان بکەین.

مامۆستا پێنجوێنی ئەم بەرهەمانەی بەجێهێشتووە:-

١-( حاشیە لەسەر گلنبوی برهان) لەعیلمی منطق دا. چاپکراوە.

٢-(حاشیە لەسەر گلنبوی اداب لەعیلمی اداب دا. چاپکراوە.

٣- حاشیە لەسەر شەرحی(تهذیب الکلام) لەعیلمی کەلامدا- چاپ نەکراوە.

٤- حاشیە لەسەر شرح المحلی لەسەر جمع الجوامع لەعیلمی(اصول الفقه)دا. چاپ نەکراوە.

٥- حاشیە لەسەر عبدالله یەزدی لەعیلمی منطق دا- چاپ نەکراوە.

٦- حاشیە لەسەر(الرسالة اللزومیه) لەعیلمی منطق دا چاپ نەکراوە.

٧- نامیلکەیەکی گرنگ لەکەلامی خوادا ئایا(حادث) یان (قدیم)- بەتیایدا بەڕەنگاری زانا هاوچەرخەکانی بۆتەوە- چاپ نەکراوە.

٨- مسائل فقهیة)(جامع المسائل) زۆربەی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس لە(جامع المسائل)ەکەیدا بەچاپی گەیاندووە.

٩- حاشیە لەسەر خەیاڵی لەسەر(شرح العقائد النسفیه) چاپ نەکراوە.

١٠- جامع الدعوات-چاپ نەکراوە.

١١- اصول الدین- چاپ نەکراوە.

١٢- حاشیەی لەسەر ئەم کتێبانەی لای خوارەوە هەیە.

ا/ گلنبوی شرح- لەعیلمی منطق دا.

ب/ حسام کاتی- لەعیلمی منطق دا.

امضی الامانی لە عیلمی معان و بیان و بدیعدا (البلاغة)

**جگە لەمانە بە پچڕ پچڕ نووسراوی تری هەیە.**

**داواکارین لە گشت ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە بەرهەمی مامۆستایان لایە بۆمانی رەوانە بکەن تا ئێمەش بە خوێندەوارانی بەڕێزی ئاشنا بکەین.**



# مەلا محەمەدی قزڵجی

## گەورە زاناو رۆژنامەنووسی کورد
## لە(٤٠)ەمین ساڵیادی کۆچی دواییدا

**م - بەفرین ( دایکی مەلیکە )**

گەلی کورد بەدرێژایی مێژوو بەچاوێکی پڕ ڕێزو بەشانازییەوە سەیری گەلەپیاوانی کردووە، ئەو گەلە پیاوانەی کەهەمیشە سەرچاوەی بەخشین بوون بۆ گەل و نیشتمانە کەیان، لەژیانو ماڵئاوا بوونیاندا.

بێگومان مۆم ئاسا رووناکی بەخشو گەرمی بەخشیش بوون لەیەك کاتداو گەل بەهرەمەند دەبێت لێیانەوە، بۆیە کەدەربارەیان دەدوێین یان دەنووسین ئارەقەی رەشو شین دەکەین، وەك ئەوە وایە پێیان بڵێین:

(بمانبەخشن، چونکە ناتوانین بەپێی پێویست وەسفتان بکەین). یەك لەو گەلەپیاوانەی کەجێگەی شانازی نەك گەلی کورد بەتەنها هەموو گەلانی موسڵمانە، مامۆستا مەلا محەمەدی قزڵجییە، کەیەکێکە لەو مامۆستایانەی کە بۆ تاقە کەسی خۆی نەژیاوەو، بەڵکو مۆمێکی نەکوژاوە بووە بۆ گەلو نیشتمانەکەی بەتایبەتیو، هەموو جیهانی موسڵمان بەگشتی ،پیاوێك بووە کەلەسەردەمی خۆیدا یان هەر وێنەی نەبووە یان ئەگەر بوو بێتیش دەگمەن وکەم وێنە بووە.

### *مەلا محەمەدی قزڵجی کێیە؟

ناوی محەمەد کوڕی مەلا حسێن کوڕی مەلا عەلی قزڵجییە، لەساڵی ١٣١٣ کۆچی بەرامبەر ١٨٩٥ز لەشاری مەهاباد لەدایك بووە، لەبنەماڵەی قزڵجییەکاندا چاوی کراوەتەوە، کەبنەماڵەیەکی ئایینو زانست پەروەرو ناووشۆرەتیان بەنیشتمان پەروەریتی لەنێوان کۆمەڵی کوردەواریدا بڵاوبۆتەوە. مەلاعەلی (باپیرەی مەلا محەمەد) لەزانا بەناو بانگەکان بووەو، دەستی نووسینی بووەو، لەسەر هەندێ کتێبی چاپکراودا نووسراوو پەراوێزی بەسوودی هەیە.

مەلا محەمەد سەرەتاییەکانی ئایینی لەلای باوکی خوێندووەو پاشان بۆ گەلێ شوێنو ناوچەی جیاجیا گەڕاوەو لەلای چەندان مامۆستای بەناوبانگ دەرسی خوێندووە، دوایش ولاتەکەی خۆی جێهێشتووەو رووی لەکوردستانی عێراق کردووەو دواتریش بۆ میسر دەچێتو، لەزانکۆی ئەزهەر- دەخوێنێت و لەئەنجامدا بڕوانامەی باڵای پێ دەبەخشرێ . لەکۆتایی ئەم هاتوچۆیەیدا دوا قۆناغی هێناوەتە شاری بەغدا، لەساڵی ١٩٣٤ لەکۆلێژی (الامام الاعظم) دەرسی وتووەتەوە.

### * مەلا محەمەدو پلەی زانستی

مەلا محەمەد وەك زانایەکی ئایینی کارامەولێهاتوو، ئاگاداریو شارەزایی بەرچاوی لەئایینی ئیسلام بووە، ودەیان قوتابی لەژێر چاودێری ئەودا خوێندنیان تەواو کردووە. مامۆستا (ئەبو زەیدی سندی) کەیەکێك بووە لەقوتابیەکانی



ـدربارەی ماموستاکەی دەڵێت: ماموستا مەحەمەد ـمیانی زوو لەمزگەوتی گەیلانی یەکەم ماموستای ـدرس وتنەوە بوو، لەچێشتەنگاودا لەقوتابخانەی ـئیلە خاتون) دەرسی وتووەتەوە، لەپێش نیوەڕۆ ـەکۆلێژی (شریعە) مەحازەرەی داوە، لەپاش نوێژی عەسریش لەمزگەوتی (بشر الحافی) لەئەعزەمیە، ـیمام بووەو مەسەلەی فەتواو گیرو گرفتی ئایینیو کۆمەڵایەتی ساخ دەکردەوە . ئەمەو لەبواری زانستی هاوچەرخیشدا شارەزایەکی بێ وێنەی بووە. دەرکی بەسوودی ئەو زانستانە کردووە لەبەرەو پێش بردنی کۆمەڵ، بۆیە هەمیشە هانی کۆمەڵی داوە بۆ خۆ بڕچەك کردن بەزانستی هاوچەرخ.

## * مەلا محەمەدو باری کۆمەڵایەتی

مەلا مەحەمەد پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆ بووەو، لەهەمان کاتدا قسەزانو گوتەشیرین بووە، خەڵکی بەحەزو تامەزرۆییەوە گوێیان، بۆ قسەکانی شل دەکردو پەندو ئامۆژگاری بەکەڵکیان ی وەردەگرت، لەم نموونە زۆرانەی هەمانە، ئەمە دەهێنمەوە، کەجار ێکیان یەك لەدۆستەکانی پێی دەڵێت: ئەمڕۆ مەلاکانی ئایینی تەنها (ئەلف و بێ) دەخوێننو (ئەلف وهاء ) یان لەبیرچۆتەوە، مەبەستی لەمە ئەوەبوو مەلاکانمان دەستیان بەخۆدا شۆڕکردۆتەوە،هیچ نابەخشنەوە. مەلا مەحەمەد ڕەتی دەداتەوە زۆر بەکورتی ولێزانی کەدەڵێ: دنیا ئەوەهایە چیت لەدەستا بێت، ئەوە دەبەخشیەوە، بۆ نموونە دەوڵەمەند ماڵ دەبەخشێتەوەو، شێخ تەریقەت دەبەخشێتەوەو مەلاو زاناکانیش عیلمو زانیاری دەبەخشنەوە.).

## * مەلا محەمەدو نیشتمان پەروەری

هەروەکو لەمەوبەر باسمان کرد مەلا مەحەمەد لەبنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەر چاوی هەڵهێناوەو بیرو مێشکی بەئاوی نیشتمان پەروەری پەرژین کراوە و بووە هەوێنی دروست بوونی گیانی کوردایەتی لەمەلا مەحەمەد، کوڵانو هەڵچوونی لەپێناو کورددا بوو، بۆیە هەر زوو خۆی گەیاندە ریزەکانی شۆڕشەکەی (سمکۆ)و، لەبەر دڵسۆزی بۆ کارەکانی لەلایەك ولێهاتوویی وکارامەیی، کاری سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (کورد)یان پێ سپارد، کەزمان حاڵی شۆڕشەکە بوو.

## * ماڵئاوایی مەلا محەمەد

لەدوا دوایەکانی ژیانیدا دووچاری نەخۆشی دەبێت وبەرە بەرە نەخۆشیەکەی زۆری بۆ دەهێنێو کاریگەری زیاتر دەبێ تا لەڕۆژی ١٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٩ چاوی یەکجاری لەیەك ناو و کۆچی دوایی کرد، ودوا ئارامگەشی بردە گۆڕستانی ئیمامی ئەعزەمی.

ماموستای زاناو ئەدیبو ڕۆژنامە نووس جگە لەو خزمەتانەی کەباسمان کردن، چەند نووسراوێکی چاپ کراوو چاپ نەکراوی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە:-

١- کتێبی (التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية ومدرسيها مع الأمام بتأريخ الأمرأ البابانية مطبعة (نجاح)١٩٣٨.

٢- التعليق على تفسير الزمخشري چاپ نەکراوە.

٣- لێکدانەوەی کتێبی حديث الأربعين- بەکوردی ، ئەم کتێبە بەناتەواوی مایەوە مەلا مەحەمەدی قزڵجی لەتێکرای تەمەنی ٦٤ ساڵەیدا ژیانێکی پڕ لەخزمەتو هەوڵو کۆشش بردۆتە سەر کەهەمیشە شایستەی ڕێزلێنانو تەقدیرە، لەیادی تێپەڕبوونی (٤٠) ساڵ بەسەر کۆچی دوایی مەلا مەحەمەد قزڵجی گەورە زاناو ڕۆژنامە نووسدا، هەزاران سڵاو لەیادو گیانی گەورە زانای کورد مەلا مەحەمەد قزڵجی .

●



# لەئەستێرە پرشنگدارەكانی قوتابخانەكانی ئایینی لەكوردستاندا مەلا محەمەد ئەمین ناسراو بە (یومنی)

نووسینی: شێرزاد رەسوڵ فەقێ

لاپەڕەكانی مێژووی كورد بەگەلێ زاناو رۆشنبیرو شاعیر رازاونەتەوە كەهەر یەكەیان لەبوارێك یان چەند بوارێكی زانستی سەردەمی خۆیدا پێشەنگی كاروانو پێشرەوی زانایان بوون، دەبینین زۆربەی زۆری هەر لەمەولەویو نالیو حوزنی موكریانیو مەلای جەزیریو حەمدیو مەحویو ئەحمەدی خانیو حاجی قادری كۆییو بێسارانیو مەلا گەورەی كۆییو خاڵو پیرەمێردو چەندانی تر دەگری لەمزگەوتو قوتابخانە ئایینییەكانیان خوێندووەو پەروەردەی حوجرەكان بووینە.

لەتەك ئەمانەش یەكێك لە مامۆستایان مەلا (محەمەد ئەمین)ە. ناوی تەواوی ئەم زاتە (محەمەد ئەمین)ە كوڕی (موستەفای) كوڕی (مەولود)ە لەساڵی (١٨٨٨)ی زایینی لەگوندی (سكتان)ی ناوچەی خۆشناوەتی لەدایك بووە.

لەسەرەتاوە باوكی ناردوویەتیە بەرخوێندن لەلای (مەلا محەمەد) لەشاری ( كۆیە)، دیارە هەر لەو كاتەشدا فەقێیەكی كوردستای ئێران لەو حوجرەیە بووە شارەزاییەكی تەواوی لەخەتی (فارسی) هەبووە كاری تێكردو لەوساتەوە مەلا محەمەد شەیدای لەگەڵ خەتدا پەیدا كردو دەستی كرد بە مەشقكردنو هاوكات لەئەوەوەش دەستی بەدروست كردنی خەنجەروشیر تیژكردنەوە كردووە.

مە لا محەمەد ئەمین دوای ئەوە دەستی كرد بەدراو دروست كردنو خەرجیشی دەكردوو یەك لەكارە گرنگەكانی ئەوكات كردی ئەوە بوو لیرەی عوسمانی ئیمزای سوڵتانی تێدا دروست كردو كەنارەكانی ئەخشاند لەساڵی ١٩١٠ بانگ كرا بۆ (سەربازی) لەكاتی عوسمانیەكان ونێردرا بۆ شاری بەسرەو كرا بەپێشەوای سەربازی لەفورنە، ساڵی ١٩١٦ دوا بەدوای خزمەتی سەربازیو تەواوكردنی مامۆستا لەشاری (بەغدا) جێ نشین بوو لەسەر لێواری شەقامی موستەنسریە دەستی كرد بەكاری (مۆر) دروست كردن بۆ ماوەیەك لەم شوێنە بوو دوای ئەوە دوكانێكی بچوكی كردەوە لەگۆڕەپانی رەشید.

مامۆستا زۆر شەیدای نووسینەكانی خۆشنووسی تورك (یومنی) بووە بۆیە ناز ناوی خۆی دەنێت بە (یومنی)یەوە.

مەلا محەمەد ئەمین قوتابی هیچ خۆشنووسێك نەبووە كەتەواوی لەلا خوێندبێت بەڵكو خۆی بۆ خۆی پێگەیاندووەو لەسەردانێكی بۆ وڵاتی شام سەردانی خۆشنووس (محەمەد وحی)ی كردووە شارەزاییو زانیاری لەخەتی كوفە لێوەرگرتووە ولەسەردانی بۆخۆشنووس (نسیب) كەئەخشێنەربووە یاسای دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١٩٠٨ هەموو بەندەكانی لەسەر هێلكەی مریشك نووسیوەتەوە ئەمەش لەمۆزەخای (ئەستەنبوڵ) لەتوركیا پارێزراوە، مەلا محەمەد لەلای ئەو فێری پیشەی مۆری لاستیكی بووەو بووە بەیەكەم كەس ئەم پیشەی هێناوەتە عێراق، مەلا محەمەد ئەمین دراوی عێراقی بەناوی مەلیك غازی یەكەم نووسیوە یەكەم دراوی كانزایی بووەو پاداشتی لەسەر وەرگرتووە، كلێشەی رۆژنامەی (الوقائع العراقیة) كێشاوەو بەخەتی كوفی نووسیویەتی.

دادگای بەغدا زۆر پشتی بەمەلا محەمەد ئەمین دەبەست بۆ ناسینی نووسینی گومانو ئیمزای دزراو، وەلەرووی كۆمەڵایەتیەوە پیاوێكی خاوەن ئایینو تێكەڵی خەڵكی نەبووە بۆیە جگە لەمنداڵەكانی كەس فێری كارە هونەرییەكانی نەبووە بەردەوام لەسەر ئەژنۆی دەینووسی پشتی بەمێز نەبەستووە.

لەساڵی (١٩٧٠) كلێشەی پەیكەری (حاجی قادری كۆیی) لەشارە خنجیلانەكەی كۆیە دروست كردووە.

مامۆستا یەكێك بووە لەخۆشنووسە ناودارەكانی جیهانی ئیسلامیو لەخەتی پێچەوانەدا شارەزاییەكی تەواوی هەبووە وشایەنی وتنە لەم خۆشنووسە



هەڵکەوتوانەی کورد وەك حامید ئامەدی خۆشنووس لەساڵی ۱۸۹۱ز لەشاری دیار بەکر لەدایك بووە لەساڵی ۱۹۸۲ز کۆچی دوای کردووە بنکەی توێژینەوەی مێژوو هونەرو رۆشنبیری ئیسلامی کەسەر بەرێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی جیهانییە بنکەکەی لەشاری ئەستەنبوڵە لەساڵی ۱۹۸٦ یەکەمین پێشبڕکێی خۆشنووسی بەناوی ئەو سازداوە کەزۆربەی خۆشنووسانیناودار لەجیهان بەشداریان تێدا کردووەو خۆشنووسانی کوردستان پلەی سەرکەوتویان بەدەست هێناوەو لەم پێشبڕکێیانەدا، وەهەروەها خۆشنووسێکی وەك مەحەممەد تاهیری کوردی کەڵەی بنەڕەتدا خەڵکی شاری هەولێرە لەساڵی (۱۹۰۲) لەشاری (مەککە)ی پیرۆز لەدایك بووە وەدەرچووی زانکۆی (ئەزهەر)ە بەم خۆشنووسە سەرەڕای کاری مامۆستایەتی لەشاری (مەککە)ی پیرۆز لەهەمان کاتدا کراوەتەوە پسپۆری دادگا بۆتێروانینی نووسین و ئیمزای ساختەو گومان لێکراو وەلەوکارە پیرۆزانەی ئەنجامی داوە نووسینەوەی (قورئانی پیرۆز) و وەنایەتەکانی رۆخی دیواری (کەعبە) پیرۆز بەناوزێڕ نووسراوی کردووەو سورەتی (القریش)ی لەسەر دەنکە نورزێکی لوبنانی نووسیوە وە سورەتی (النصر)ی لەسەر دەنکە گەنمێك نووسیوە ئەم خۆشنووسە لەساڵی (۱۹۸۰) کۆچی دوایی کردووە، وەدوا بەرهەمی پیرۆزی خۆشنووسانی کورد مامۆستا (بڕار کریم) لەهەندەران ساڵی پار نووسینەوەی قورئانی پیرۆزی لەئەڵمانیا تەواوکرد. مەبەوە ئەوەبڵێین مەلا محەمەد ئەمین (یودسی) ساڵی ۱۹۷۲ لەشاری بەغدا کۆچی دوایی کرد خوا لێیخۆشبێت و بەبەهەشتی بەرینی خۆی شادبکات.

# مەلا فەندی

## ئا: لوتفی عەبدولفەتاح (شۆڕش)

لەکوردستاندا، زۆر بوون ئەوانەی بەدەست ودڵو دیدەو دەروونو قوربانیدان بەجەستەو رۆحی شیرینیان خزمەتیان بەرێبازی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کردبێتو ئێستاش وەك ئەستێرە گەشەیەك لەئاسمانی مێژووی ئیسلامدا دەردەکەونو خۆیان بەمرۆڤ ئاشنا دەکەن... هەڵبەت کاروپیشەی چاکەو خێرو بەرەکەت لەنیگای پرشنگداری مامۆستایانو زانایانی ئایینیو بوێژانی چاخی ئیسلام دەبارێتو هاوکات باوەڕو هەڵوێست تۆکمەیی ئەو نووسەرو وێژەرە ئایین پەروەرانەش بوونەتە فاکتەرێك بۆ بەرەو پێش بردنی رەوتی بزاوتی ئیسلامیو خستنە گەڕی کەژاوەی مێژووی رۆژنامەگەری ئایینی لەپێناو زیاتر خزمەت گەیاندن بەو رێبازەی حەزرەتی محەمەد پێغەمبەر (ﷺ) گرتویەتیەبەر.. بەڵێ زۆرن ئەوانەی جوامێرانەو ئیمان پتەوانە، شەوو رۆژیان خستۆتە پاڵیەكو لەخزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا قوربانییان بەجەستەو رۆح داوەو خۆیان کردۆتە سوتەمەنی ئەو ئایینەی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەری نازداری(ﷺ) بەدیاری ناردۆتە خوارەوە... هەنووکەش لەو گۆشەیەدا باس لەیەکێك لەو مامۆستاو زاناو شاعیرە بلیمەتە ئایین پەروەری گەلەکەمان دەکەین کەتا دوا ماڵئاوایی لێکردین لەخزمەت ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا شیعری تەسەوفو ئایینی بۆ هۆندینەوە، کەئەویش مامۆستای شاعیرو ئایین پەروەر (مەلا فەندی) ئەمرە.

### مەلافەندی کێیە؟

(مەلا فەندی) ناوی تەواوی مامۆستا ئەبوبەکر مەلا حاجی عومەرەو ناز ناوی (مەلافەندی)یەو لەساڵی (۱۸٦۳ز) لەشاری هەولێری دێرین پایتەختی ئێستای(هەرێمی کوردستان) چاوی گەشی بەژیانی پڕ لە رووداوو کارەسات هەڵهێناوە، هەڵبەت مامۆستا (مەلا فەندی) ئەمر تا لە ژیاندابووە سەری بۆ کەس شۆڕنەکردووەو لەدوژمنان سڵی نەکردۆتەوە تا مەرگیش ئامێزی تێوەرێنا خاوەنی ئەمەكو هەڵوێستو بڕواقایمی خۆی بوو، ئەمەو مامۆستا مەلا فەندی خوالێخۆشبوو لەبواری هۆنینەوەی شیعری تەسەوفو ئایینیدا خاوەنی گەورەترین توحفەو شیعرو نوسینێکی زۆری ئایینی بوو، تەنانەت شیعری بەهەر سێ (۳) زمانی (عەرەبیو کوردی فارسی) هۆندۆتەوە بەڵام سەدحەیفو مەخابن مامۆستا مەلا فەندی لەرۆژی ۱۹٤۳/۱۲/۳۱ی زایینیدا لەشاری هەولێر، کۆچی دوایی کرد





# شورەشا شێخ سەعیدێ پیران

مەهدی تەیب مزوری

پشتی ل ناڤ چونا دەولەتا کوردی کاودانێ کوردستانێ رۆژ ب رۆژ بەرەڤ خرابیێ دچوو. پشتی شەری چالدەران د سالا ١٥١٤ کوردستان هاتە دابەش کرن دناڤبەرا ئمپراتوریەتا سەفەوی‌و ئوسمانیا.

ل پەیمانا (لوزان) جارەکا دن کوردستان هاتە دابەش کرن دناڤبەرا چار دەولەتێد پاشکەفتی، ڤان دەولەتاژی پێکول د کر بول ناڤ برنا تیتال‌و هزمان وفولکلورێ کوردی.. هتد گوندێد کوردا خاپووردکرن. زاروك و ژن‌و زەلامێد کوردا د شەوتاندن ئابوریا کوردستانێ تێکدا. میللەتێ کورد کەفتبونە ناڤ کاودانەکی نەخوش. لێ میللەتێ کورد ب چاڤ نەترس‌و زیرەك و عەگید ناڤ بانگ بوونە.

چیتر ئەڤ رەوشتە قەبیل نەکرو، شورەش دیڤ شورەشێ بەرپا دکر دژی دژمنێد خوین خار، بوسەرخەبونێ، رزگاریێ، هەلژینا بێهنا ئازادیێ مینا شورەشا شێخ سەعیدێ پیران وقازی محمد وعبدالسلام بارزانی‌و شێخ محمود حەفیدو سمکو شکاك ومستەفا بارزانی... هتد.

ئێك ژڤان شورەشا، شورەشا شێخ سەعیدێ پیرانە، شێخ ب درێژاهیا ژیێ‌خوە دژی دژمنێدخوین خار راوستایە. ئەو رەشا کو ب سەرملەتێ کورد هاتییە قبول نەکردییە.

## شێخ سەعیدێ پیران کێیە؟

ناڤێ دی سەعیدە کورێ عەلییە د سالا ١٢٨٥ مشەختی ل دڤەرا دیار بەکرێ ل گوندی (سبتی) ژ دییا خوە بویە. باڤێ وی ژزاناو خودێ ناس و رەوشەنبیرو کەنکەنێد چاخ و دەمێ خوە بویە، سەر ب رێگا (تەریقە) نەقشبەندی بویە. ل شەرع و دیندار زانایەکێ شەهرەزا بویە.

شێخ ژ بنەمالەکا رەوشەنبیرو زاناو خودان ئایین‌و سەیدو روحانی‌و دیندار مەزن بویە. ژ ب ڤێ هەگەرێ هەر ل لاوینیا خوە داب دینداری‌و تەقواو ژ خودێ ترس تاڤبانگ بویە.

شێخ ل زاروکانیا خوە ل چەم باڤێ خوە خوندییە، پاشێ ل چەم چەند زاناو شەهرەزایێد دەڤەرێد خوە خوندییە ل دانانا هوزانا دەستەکێ مەزن هەبویە چەندین هوزان باکوردی وفارسی وتورکی ڤەهاندینە.

پشتی مرنا باڤێ خوە دسالا ١٣١٦ مشەختی شێخ دبێتە جهنشینا باڤێ خوە ل سەر هەمان رێگاوی د چید دەست د کە ب لاڤ کرنا دینێ ئیسلامێ. چەندین زاناو مروڤێدلێهاتی



پەروەردە دکەت نزیکی (٥٠) هزار دەروێش ومریدو خەلیفە هەبونە، هەمی ژی ل ژێر فرماناوی دا بونە.

## (هەگەرا رابونا شورەشا شێخ سەعیدێ پیران)

تێکچونا حکومەتا ئوسمانی پێش هاتنا ئەتاتورکو دارو دەستەکا وی ل پەیمانەکێ ب ناڤێ (سیڤەر) ل مادێد (٦٢،٦٣،٦٤) حەقتێ سەرخەبونێ بو میللەتێ کورد هاتبوو دیارکرن. پاش هاتنا ئەتاتورك و دارو دەستەکا وی ل پەیمانەکێ ب ناڤێ (لوزان) ل سالا ١٩٢٣ زاینی کو ل ناڤبەرا دان دەولەتێد ئێك بوی هاتە گرێدان. پەیمانا سیڤەر هاتە تێکدان ج حەق و ئازادی بو میللەتێ کورد نەهێلان.

چێکرنا داد گەهەکێ، بو مەحکوم کرنو سێپێکێ دانا شێخ و مەلاو کەنکەنێد کورداو دەستویرا ژ بەین برنا زانایێد ئولی و جودا کرنا دین ژ سیاسەتێ.

تالان کرنو شەوتاندن و کوشتن ولێدانو زولمو زوری کول مللەتێ کورد دهاتە کرن تا نها ژی یا بەردەوامە.

خوێندنگە هـ هاتنە داخستن. ئاخافتن ب هزمانێ کوردی قەدەغەکرا، جلوبەرگێد کوردیو چەژن نەهێلان، ئابوریا کوردستانێ تێکدا، گوندێد کورد خاپور کرن، سەروکێد کوردا ژ وولاتی دویر ئێخستن....

زێدە بونا فەسادو بێ دینیێ ل ناڤ دامو دەزگهێد حکومەتا حاکمدا کو هەتا نهاژن شیوە وشیونە وارێد خویایەو دهێتە دیتن.

ژ ناڤ برنا تیپێد قورئانێ و ئیسلامێ چێکرنا تیپێد لاتینی ل جهێ دان، گوهرینا بانگی لە پەیڤێد ئەدەبی بوتورکی، روژائێك شەمبی کری یە روژا بێن ئەوانێ ل جهێ ئێنی یێ، نەهێلانا چەژنێد رەمەزانێو قوربانی رێ. ئەڤەهەمی بونە هەگەرا رابوناشورەشا شێخ سەعیدێ پیران، چونکە ل بنەمالەکا چاڤ نەترسو ئازاو عەگیدو خودێ ناسو دیندار مەزن بویە، شێخ هەست ب ڤان ئازارو نەخوشیا مللەتێ کورد کریە وکو چەوا ب دەستێ دژمنا تێنە شەوتاندن. ئەڤەژی پشتی سەرهەدانا هزرا ناسیونالستێ دناڤ ولاتێد تورکاو ئەرەباو فارسا بو.

## دەست پێکا شورەشێ:

پشتی شەرێ جیهانا ئێکی مللەتێ کورد ژی مینا هەمی مللەتێد جیهانێ هزار ئازادیێ، سەربەستیێ، سەرخوە بونێ دکر، بوڤێ مەرەمێ ژی چەندین کومەلێو پارتێد سیاسی درست بوون مینا: کۆمەلا (هیڤی)، پارتا (مللەتێ کورد) کومەلا (بەلاڤ کە رێد سیاسی).. هتد



شێخ کول بنەمالەکا روحانی وخودێ پەرستو ج چارا سەر بو دژمنا شور نەکرییە مەزن ببو. بخوژی ئێك بو ژ زانایێد ناڤ وبانگ ل کوردستانێدا، کورێزەکا مەزن هەبوو دناڤ مللەتێ کوردا. ژ بەرهندێ نەکارییە هەڤبەر ڤێ زولمو زوریێ وبێ دینیێ راوستید.

شێخ ب مەردما پێك ئانینا شورەشەکا مەزن. دەست کر ب چێکرنا رێکخستنێ. کاغەزو نامەو خەبەر رێکرن ژهەمی موسلما نارا، شێخو مەلاو کەنکە



نێد کوردستانێ، داخاز ژ وان کر کوهەڤبەری ڤێ کریارامەزن کو دەرهەق میللەتێ کورد تێدەکرن راوستن. هەروەسا خەبەر بو وان سەربازو ئەفسەرێد کورد کو باوەڕ پێ ئانییە ل ناڤ سوپایا تورکا دابون هنارتن، کو ئەو ژی بەشداری ڤێ شورەشێ دا بکەن.

جهێ دەست پێکا شورەشێ هاتە دیاری کرن پشتی جڤینەکێ شێخ د گەل سەرکردێد کورد و خالد بەکێ جیرانیدا کو ل روژا ٢١ مارس سالا ١٩٢٥ ل بازاری (گەنج) دەست پێ بکەن لێ پێش ڤێ رێکەفتنێ ل گوندێ پیران د ناڤبەرا ژەدرمێد تورکاو هنەك ژ مروڤێد شێخی شەرەك رویدا. دڤی شەریدا دوو ژەدرمێد تورکا هاتنە کوشتن . پشتی ڤی شەری حکومەتا تورکا ل رازا شورەشا کوردی هایدار بوو.

حکومەتا تورکا لەشکرەکێ مەزن پێك ئانی ب (٢٥) هزار کەساو ب هەمی چەکێدکران بو ناڤ برنا شورەشا کوردی . لێ شێخ ب ڤێ رازی پێ حەسیا هەڤبەری وان لەشکرەك پێك ئانی ب سەروکاتیا خوە کو (١٠٠٠) کەس دەبوون.

دەمێ شەر گەهشتە دەست پێکرنێ، دناڤبەرا حەڤێو نەحەقییێ. شورەشا کوردی ب باوەرییەکا موکم شەر دکر بو ئازادییا میللەتێ کوردو سەرخوەبونێ تێدەکوشی. هەر ژوی سەرکەفتن دیڤ سەرکەفتێ ب دەست ڤە دینا. حکومەت ب هەمی چەکێدگران و پێشکەفتی ژ هەڤبەر شورەشا کوردی شکەستن دخار.

ل (٢٦) شاطێ هات و چو دناڤبەرا بازاری خاپووری هاتە گرتن ب دەمەکێ کێم بازاری خاپوور بهێنا ئازادی پێ هەلژی.

ل (٧،٦) ئاداری سالا ١٩٢٥ شورەشگێرن کورد بازاری دیار بەکری محاسرەدا شورە شگێرن کورد ب باوەری یەکا موکم ب سەر کردایەتیا شێخ سەعیدی پیران زوربەی دڤەرێدکوردا هاتنە ئازاد کرن، بهێنا ئازادیێ هەلژی. دژ منێد کورد هەڤبەری ڤان شورە شگێرا سەر سورمان بوون. با زیرەکی ولێهاتیو عەگیدی یا وان. کوچەوا بو میللەتێ کورد خەبات د کەن؟ چەوا جانێ خوە دکەنە قوربانی درێیا رزگارییا میللەتێ کورددا؟ ژ بەر ڤێ هەگەرێ دژمنا چ چارە ب ڤان شورەشگێر نەدکر. کاودانێد وان روژ ب روژ بەرەف هرفتنێ د چوون حکومەتا تورکا بومانە فەسەر حکومی پەنا برە دەولەتێد ئوروپی کو هاریکارییا وان بکەن.

حکومەت بوخاپاندنا شورەشا کوردی ب هاریکارییا دەولەتێد ئوروپی لەشکرەك ب (٣٠) هزار کەساو ب هەمی چەکێد مەزن هنارتنە کوردستانێ ئەوێدشك لێ بایە کوهاریکاریا شورەشێ د کر ئان سەرب شورەشێ بونە د کوشتن مالێد وان د سوتاندن.

ل شەرێکی گەلەکێ مەزن دناڤبەرا لەشکرێ برسیو تێهنی وخودان چەکێد سڤك د گەل دژمنێد خودان چەکێد گران و پێشکەفتی و ب پالپشتیا دەولەتێد ئوروپی رویدا. ل ڤی شەری دا لەشکرێ شێخی شکەستو چەندین شورە شگێرن کورد هاتنە شەهید کرن (٥٧) کەسێد ناڤ وبانگ دناڤ شورەشێ دا هاتنە گرتن. کو شێخ سەعید ژی ژناڤ وان دا بوون.

ل هەیڤا تیرمێ دسالا ١٩٢٥ داد گەهـ مزمانا سێپێکێ دانا شێخ سەعید و چەندین هاڤالێدوی هاتەدان پاشێ ل مەیدانا بازاری دیاربەکر دگەل ٤٠ کەس ل سێپێکیدان.

**مفاژڤان ژێدەرا وەرگرتییە :**

١- کورد لەسەدەی (١٩-٢٠)دا، نوسینی کریس کوچەرا ، وەرگێرانی محمد ریانی.

٢- چەند لاپەرەیەك لەمێزووی گەلی کورد د . کەمال مەزهەر.

٣-القضیة الکردیة والحل الاسلامی الشیخ عمر الغریب.

٤-گوڤاری هیوا،/ هژمارە ٧.

٥- گوڤاری رابەر هژمارە ٣.



# پێشەوا قورتوبی لەچەند دێڕێکدا

ئا: سامی حاجی عبدالله سورچی

یەکێك لەزانا هەرە بەناو بانگەکان بەتایبەتی لەتەفسیری قورئاندا، زانای پایە بەرزو بەتوانا پێشەوا (قورتوبییە) دەمەوێ لێرەدا یادی بکەینەوە لەچەند رووێکەوە، ناوو جێگای،زانستی، خوو رەوشتی، بیرو بروای، زانست لە سەردەمی ویدا.

## (ناوو نیشانی)

ناوی تەواوی ئەم زاتە: محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی بەکری کوڕی فەرەحی ئەنصاریی خەزرەجییە، لە (قورتوبە) لەدایك بووە بەلام سالی لەدایك بوونی دیارینەکراوە، هەر چەندە هەندێك لەمێژوو نووسان دەلێن لەسەردەمی خەلافەتی (یعقوب کوڕی یوسف) لەدایك بووە کەدەکاتە سالی ٥٨٠-٥٩٥ه/ خوێندنی بەم شێوەیە دەست پێدەکات کەهەر لەمندالیدا دەستی کردووە بەخوێندنی قورئانی پیرۆزو زمانی عەرەبیو فێربوونی شیعر. لەکاتی خوێندنیدا چەند جێگایەکی کردووە بۆ وەرگرتنی زانست وەك (بلنسیة)[١]و (اشبیلیة)[٢] و (فاس)[٣]. لەلای زۆر لەمامۆستای بەرزی خوێندووە وەك (ابو جعفر احمد) کە ناسراو بوو بە (ابو حجة)وە (ربیعی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئەحمەد) بەم شێوەیە مایەوە لە(قورتوبە) دەیخوێندو لەپاشان دەرسی دەوتنەوە تاچوو بۆ ولاتی میسر، وەك دکتۆر (امجد احمد بدری) لەگۆڤاری (الرسالة)دا دەلێت: (قورتوبی لەدایك بووە لەولاتی ئەندەلوس وەشارەزاییەکی باشی وەدەست هێنا لەفقەو نەحوو قرائاتو بەلاغەو زانستەکانی قورئانی... هیتد ئینجا چوو بۆ ولاتی میسر وەهەروەها چووە بۆ (اسکندریە)(٤)و لەپاشان چووە بۆ (منیەی بەنی نصیب)(٥) لەوێ ماوەتەوە تالەسالی ٦٧١هـ. لەشەوی دووشەممە ٩ی شەوال کۆچی دوایی کرد (خورەوشتیو رۆشبیری) ئەم زانا بەرێزە خاوەنی تەقواو لەخواترسو بەوەزع بووە، خاوەنی رەوشتێکی بەرزبووە، بەلێ مێژوونووسان مەدحی دەکەن بەتایبەتی لەبواری خورەوشتی وەك (الداودی)[٦] کەدەلێت: (قورتوبی یەکێکە لەبەندە چاکەکانی خودای گەورە، زانایەکی بەتەقواو لەخوا ترسبووە، زاهید بووە لە دونیا، خۆی خەریك دەکرد بەکاروباری قیامەت، کاتەکانی کورت کردبووەوە لەبەینی خواپەرستیو دانانی پەرتوك، وهەروەها دەلێت مرۆڤێکی بێ تەکلیف بووە کاتێك دەرۆیشت تەنها جلو بەرگێکی لەبەردابوو لەگەل کراوێك کەدایدەنا لەسەرسەری.

وەلەبارەی رۆشنبیری، زانایان پێیان هەل گوتووە وەك ابن شاکر کەلەبارەی دەلێت[٧] (قورتوبی شێخێکی زۆر بەرێزبووە زۆر نووسراوی هەبووە کەئەمەش بەلگەیە لەسەر زانستە زۆرەکەی ابن العمادیش دەلێت[٨] بەراستی پێشەواو زانا بوو دەستێکی بالای هەبووە لەبارەی مانای فەرموودەو چاك گواستنەوەی فەرموودە، وەهەروەها لەجوان نووسینی پەرتووکدا. بەلێ ئەم زانا بەرێزە زۆر نووسراوی هەنە کەئەمەش بەلگەیە لەسەر زیرەکی وعالیو رۆشبیریی، ئەمەش ناوی هەندێك لەنووسراوەکانی:

١- تەفسیری (الجامع الاحکام القرآن) ٢٠ بەرگ.
٢- التذکرة في احوال الموتى وأمور الاخرة)
٣- التذکار في افضل الاذکار
٤- الانسی في شرح اسماء الله الحسنی
٥- الاقضیة.

وەچەندین پەرتووکی تر، کەبەراستی لەمەدا رەوشتو رۆشنیریو زانایەتی ئەم زانا بەرزەمان بۆ دەردەکەوێ کەپێشەوا (الذهبي) لەبارەیدا دەلێت: ( امام متفنن متجر في العلم له تصانیف مفید تدل على کثرة اطلاعه و وفور عقله وعلمه)

## (بیرو بروای قورتوبی)

هەندێك لەمێژوو نووسان دەلێن [٩] بیرو بروای خەلکی مەغریب وئەندەلوس لەدوای ئازاد بوونی لەلایەن





لەشکری ئیسلام بڕوایەی سوننیو سەلەفی بووە) تا ئەو کاتەی (محمد کوری تومرت) دانەری دەوڵەتی موەحیددین هات وەریگێڕانە سەر عەقیدەی پێشەوا (الاشعری) بەڵێ - لەگەڵ ئەمەش عەقیدەی موعتەزیلەشیان تێدابوو- زاناو شەرع زانان مەزهەبی ئەشعەریان هەڵبژاردو بەرگریشیان لێدەکرد هەتا فیشاری زۆریان بۆ موعتەزیلەکان برد، یەکێك لەم زانایانە پێشەوا (قورتوبی) بوو لەسەر مەزهەبی ئەشعەری بووەو بەرگریشی لێکردووە جائێمە چەند نموونەیەك لە تەفسیرەکەیدا دێنینەوە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کەئەشعەری بووەو بەرگریشی لێکردووە.نموونەی یەکەم: لەتەفسیری ئایەتی ﴿ **قال فبما اغويتني لاقعدن لهم صراطك المستقيم** ﴾[10] دەڵێت هیدایەت وگومرای بەدەست خوایە، نەك وەك موعتەزیلەکان کە دەڵێن گومرایی بە دەست خوانیە.

نموونەی دووەم: لەتەفسیری ئایەتی ﴿ **واعلموا أن الله يحول بين المرء وقلبه** ﴾(١) دەڵێت ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر خالیقییەتی خودا بۆ ئیمانو کفرو هەموو شتێك.

نموونەی سێیەم: لەتەفسیری ئایەتی ﴿ **ومن الناس من يقول أمنا بالله و باليوم الاخرو ماهم بمؤمنين** ﴾[12] دەڵێت ئەم ئایەتە بەرپەچی (الكرامية) دەداتەوە کە گوتویانە بڕواداری بەدەر دەکەوێ بەگوتن بەزوبان جا با بەدڵیش نەیلێ بەڵێ (قورتوبی) مەیلی تەئویلیشی هەبووە کەئەمە بەدەر دەکەوێ لەگەڵێك جێگا لەتەفسیرەکەیدا. لێرەدا دەرکەوێت کە قورتوبی سوننی وئەشعەری بووەو مەزهەبی (اهل السنة والجماعة)ی سەر خستووەو بەرگریشی لێکردووە.

## بزوتنەوەی زانستی لەسەردەمی قورتوبیدا

لەسەردەمی دەوڵەتی موەحیددکان ژیانی زانستی لە مەغریبو ئەندەلوس لەپێشکەوتندا بوو، کەلەو سەردەمەیدا قورتوبی ژیاوە ئەم پێشکەوتنەش لە چەند ڕوویکەوە بووە ١- دانەری دەوڵەتی موەحیددین (محمد کوری تومرت) یەکێك بوو لەزانا هەرە بەرزەکانی سەردەمی.

٢ زۆری پەرتوكو نووسرانی کەلەئەندەلوسیا بوون، کەتا گەورەکانیش مەبەستی هەرە گەورەیان دانانو کۆی پەرتوك بووە بۆ نموونە (زادا المقری)[13] لەبارەی (المستنصر باالله)دا دەڵێت زانستی زۆر خۆشدەویست ورێزی لەخاوەنەکانی دەنا، پەرتووکی کۆ دەکردنەوە بەشێوەیەکی وا کەهیچ لەگەورەکانی پێشخۆی شتی وایان نەکردووە.

جا وەنەبێت تەنها گەورەکان وابووبن بەڵکو خەڵکی ئەندەلوس مەبەستیان هەر ئەمە بوو بەتایبەتی خەڵکی (قورتوبە) جا بەهۆی گەورەکانو زانایان زانست گرنگی پێدرا لە ئەندەلوس وەدەورووبەری دابوو بەمەڵبەندی ڕاپەڕینی زانستەکانی ئایینی وەك فقەو فەرموودەو تەفسیرو قرائاتو نەحوو صرفو تاریخو ئەدەب، بەڵێ زانا قورتوبیش دەورێکی زۆری هەبوو لەبەرەو پێشبردنی زانستدا.

لەکۆتایدا داواکارین لەخوای گەورە کەلەم زانا پایەبەرزە وگشت زانایان خۆشبێت، وەخوا پاداشتی خێریان بداتەوە بۆ ئەو خزمەتەی کەبەئیسلامو موسڵمانانیان کرد....

---

**سەرچاوە:-**


١- القرطبي ومنهجه في التفسير
دانراوی دکتۆر القصبي محمود زلط
٢- الجامع الاحكام القرأن بەرگی (١)


---

**پەراوێزەکان**

١- شارێکە لەئەندەلوس دەکەوێتە ڕۆژ هەڵاتی (قورتوبە).
٢- شارێکی گەورەیە لەئەندەلوس دەکەوێتە ڕۆژئاوای (قورتوبە).
٣-شارێکە لەشارەکانی مەغریب.
٤- شارێکە لەمیسر.
٥- شارێکە لەباکوری (اسیوط)
٦- طبقات المفسرين للداودي
٧- شذرات الذهب لابن العماد.
٨- عيون التأريخ.
٩ تاريخ الاسلام.
١٠- اية ١٦ من سورة الاعراف
١١- تقع الطيب ج١ ص١٨٠.
١٢- اية سورة الانفال ٣٤.
١٣- اية ٧ من سورة البقرة.



# ئایین باوەڕە، ئایین بەندایەتی خودایە پاش ئەوانە ئایین ژیارە

عوسمان عەبدولڕەحمان سمایل

لێکۆڵینەوەی ژیاری لەم سەردەمەدا گرنگییەکی زۆری پێ دەدرێ، وبڕێکی زۆری لەلایەن مێژوونووسان و بیریاران و نووسەرانی ژیاریەوە لەسەر نووسراوەو دەنووسرێ، لەمەشدا زۆر بیروڕای جیاواز بەگوێرەی بۆچوونی تایبەتی هاتۆتە ئارا، بەڵام لەگەڵ لایەنیشەوە یەك دەگرنەوە. لەوانە زۆربەی پسپۆڕانی ئەم بوارە لەپێناسی ژیاردا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەوا (ژیار هەموو لایەنێکی ژیانی ماددی مرۆڤ دەگرێتەوە لەبیروڕا، ڕەوشت، یاسا، ئەدەب... کە بۆ چوونی تایبەت سەبارەت بەژیان، مرۆڤ، گەردوون دروست دەکەن).

هەروەها سەبارەت بەبنچینەی دروست بوونی ژیاریش ئەوا زۆربەیان ڕاکانیان یەك دەگرێتەوە. مێژوونووسی گەورە (ئارنۆلد توێنبی) ڕای وایە (ژیار تەنها لە ئایینەوە دروست دەبێت نەوەك لەشتێکی تر)[1].

هەروا فەیلەسووفی ئیتالی گەورە (گیۆڤانی باتیستا ڤیکۆ) (١٦٦٨-١٧٤٤ز) پێی وایە (ژیارەکان بە بیر کردنەوەی ئایینی دەست پێ دەکەن)[2].

(پرۆفیسۆر فیبلمین) گەیشتۆتە ئەم ئەنجامەی (ئایین دەبێتە هۆی ڕۆشنبیری، ڕۆشنبیریش دەبێتە هۆی ژیار)[3]. بۆ سەلماندنی ئەم وتانەی سەرەوە ئەوا (دکتۆر حەسەن حەنەفی) بەم شێوەیە باس لەسەرهەڵدانی ژیارەکان دەکات: (ژیارە ناسراوەکانی تاوەکو ئێستا دروست بوون ژیاری بنکەیین، لەسەر یەك بنەما دروست بوون ئەویش ئایینە. جا ئەوەش چ ئەفسانە یۆنانیەکان بێت سەبارەت بەژیاری یۆنانی یائینجیل سەبارەت بەژیاری ئەوروپی، یا تەورات سەبارەت بەکەلەپووری جوولەکە، یانووسراوە مردوو ئەفسانە میسریەکان بێت سەبارەت بە ژیاری میسری کۆن، یایاساکانی حامورابی بێ سەبارەت بە ژیاری سامیە کۆنەکان، یا ئامۆژگاریەکانی کۆنفۆشیۆس بێ سەبارەت بەژیاری چینی کۆن، یالەفیدانتا سەبارەت بەژیاری هیندی، یاخود لەقورئان و سوننەتەوە سەبارەت بە ژیاری ئیسلامی)[4].



کەچی هەندێکی تر لەمە تێپەڕدەکەن وپێیان وایە ژیار دروست نابێت تەنها بەهۆی بوونی ئاینێکی ڕاستەقینەی ئاسمانیەوە نەبێت[5]. بەمەش وا بەدیار دەکەوێ ژیار لەبەرهەمەکانی باوەڕە، وێنەیەکی تایبەتی ژیان بۆ



پەیڕەوکەرانی دەکێشێ، گرنگییەتیان نیشان دەدات، هەر لەم گرنگییەوە مرۆڤ پاڵ دەنێ بۆ کارکردن، چالاکی پەرەسەندن دروست دەبێت، پێشکەوتن روو دەدات و ژیار دروست دەکات[٦].

ئیسلامیش وەك ئایینێکی ئاسمانی خوایی، لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی بۆ پێغەمبەری خۆشەویست (محەممەد د.خ) بەهۆی قورئانەوە بەسروش دابەزیوە، بەرەزامەندی خوای گەورە بۆ پابەند بوونی بەندەکانی پێی ﴿ورضيت لكم الاسلام دينا﴾ المائدە/٣.

ژیاری ئیسلامی لەگەڵ دابەزینی یەکەم ئایەت لەقورئانی پیرۆز دەست پێ دەکات. دوای ئەوە دەست بەچەکەرە کردن و رەگ دانان دەکات، ئیتر ئەم ژیارە لەسەردەمە یەکەمەکانی گەیشتە لوتکەی هەرە بەرز و بڵندی مرۆڤایەتی کەتاوەکو ئەوکات مێژووی مرۆڤایەتی ژیاری لەم جۆرەی بەخۆیەوە نەدی بوو تاکۆتایی ژیانیش بەخۆیەوە نایبینێ مەگەر تەنها لەژێر پەیڕەوی کردنی راستەقینەی ئەم پەیامە خواییەوە نەبێت کەدووبارە دەیگەێنێتەوە ترۆپك.

ژیاری ئیسلام کۆمەڵە چەمکێکە لەبۆچوونی ئیسلام بەرامبەر ژیان لەسەر بیروڕای پەیامی پیرۆزی ئیسلامەوە دەوەستێ، چەمکەکانیش لەبۆچوونی گشتی بۆ مرۆڤ و ژیان و گەردوون وەردەگرێ، و وەرگرتنی هەموو ئەو شتانەی لەم بینینە هەڵدەقوڵێ، یالێی جیا دەبێتەوە. یا دەبێتە هۆیەك لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو وەدەست هێنان[٧].

ئیسلام کاتێ هاتەکایەوە ئیمپراتۆریەتەکانی ئەم سەردەمەی شکاند، نەوەك تەنها بەهێزی چەك و بەڵکو بەهێزی بانگەوازی ئیسلامی کەبانگی یەکسانی دەدا لەنێوان مرۆڤ. وای کرد گەلەکانی ئەم ئیمپراتۆریانە بەئاسانی ئیسلام وەرگرن، بۆ ئەوەی لەم ستەمو چەوساندنەوانەی لەژێر دەستی ئەوانەوە دی بوویان دەربچن[٨]. هەر ئەمەشە وای لەزانا (ریچارد سۆلیڤان) دەکات بڵێ: ئەمە پووختەکەیەتی( ژیاری ئیسلامی تەنها بەرهەمی ئایینی ئیسلامە، عەرەب نەیان دەتوانی بەم شێوە گەورەیە- ئەم ژیارە - پێش بخەن گەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەبوایە، کەوا پاڵینان بۆ کارکردن و بەدەست هێنان و داهێنان[٩].

لەبارەی مێژووی ژیارەکان ئەوا دەگوترێ ژیارەکان نامێنن و دەمرن کاتێ خەڵکەکەی دەڕۆن و وازی لێ دێنن، یاکاتێ دەشکێن و دەبەزن بەرامبەر هێزێکی بەربەری خوێن ڕێژ. بەڵام ئیسلام بەپێچەوانەوە لەماوەی مێژووی ژیانی دوورو درێژیدا چەندەها جار کەوتۆتە بەر زەبرو زەنگی هێزی درندەو لەناوبەر، بەڵام توانیویەتی رەسەنی و پاکی خۆی بپارێزێ و بۆ چەندەها جاربنیاتی ژیاری خۆی بنێتەوە. ژیاری ئیسلامی پاش ئەوەی لەهەر دوو سەدەی دوانزەو سیانزەی زایینیدا لە بەرامبەر مەغۆل و دواتر خاچپەرستەکان لەڕۆژ ئاوا گەمارۆدرا، کەچی لەناو نەچوو، لەکاتی جەنگی خاچپەرستەکان ئەوا جیهانی ئیسلامی لەژێر سەرکردایەتی نەوەی پاڵەوانی ئیسلام و رۆڵەی بەوەفای کورد، سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی توانی لەجەنگی حەتین لەساڵی (١١٨٧ز) بەسەریان زاڵ بێ. دووەمیش داگیرکەرە تەتەرەکان کەجیهانی ئیسلامی ئەو کاتیان شکاند، بەڵام هێزە مەعنەوی وگیانیەکەیان پێ نەشکا، دوای ئەوە بانگەوازی ئیسلامی بەسەر تەتەرەکاندا سەرکەوت و گشتیان ئیسلام بوون[١٠].لەم بارەیەوە جامیر (jamier) دەڵێ: (ئەو بەربەریانەی هەندێ وڵاتیان داگیر کرد لەناویان توانەوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەوە ئیسلام خۆی چەسپاند لەسەر ژیارە کۆنەکان، بەڵکو ئیسلام یارمەتی خەڵکیدا بەرەگەزی داهێنەر بۆیە ژیارێکی نوێ وەبەرهێنا)[١١].

هەروەك باسمان کرد ژیاری ئیسلامیش هەروەك ژیارەکانی تر هەندێ کات تووشی لاوازی کۆسپ و تەگەرەی گەورە بووە بەتایبەت لەسەردەتای دەست پێکردنیەوەو سەدەکانی ناوەراست، بەڵام زۆر



بــەزوویی بـــەهێزو تینـــی (قورئـــانی پـــیرۆز) هەڵدەســتێتەوە، گومانیشــی تیــا نیــە کــە تــاوەکو (قورئان) مابێ ژیاری ئیسلامیش هەر دەمێنێتەوە[١٢]، خوای گــەورەش پــەیمانی داوە بەمانــەوەی تــاکو رۆژی دوایی ﴿ **إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون** ﴾ الحجر-٩.

هــەروەك ئیسلام ئــایینێکی خواییــە کــۆن و نوێــی بۆنیــە، و لەســەر بنچینــەی قورئــان دامــەزراوە، بۆیــە هەمیشــە هێزەکــەی لــەناو خۆیــدا ماوەتــەوە، لەبــەر ئــەوەش هەڵەیــەکی گەورەیــە حوکــم لەســەر ئیسلام و ژیارەکــەی بدەیــن لــەڕووی بــارو دۆخــی موسڵمانانەوە[١٣]. ئــەوەتا ئێستاش ژیاری ئیسلامی لەدوای چواردەسەدە زیاتر لەبەخشش هــەر لــەناو گەلە موسڵمانەکان ماوەتــەوە وکێ بڕکێش- منافسة لەگەڵ ژیاری رۆژئاوای مەسیحی و پاشماوە ژیارە کۆنەکانی تر دەکات خوای گــەورەش لــەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی ﴿ **ولو أن أهل القرى ءامنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء و الأرض ولكن كذبوا فأخذناهم بما كانوا يكسبون** ﴾ الاعراف،٩٦.

**سەرچاوەو پەراوێز:-**

١) د. جورج حنا، الحقيقة الحضارية. دار العلم للملايين، الطبعة الاولى بيروت، ١٩٥٨، ص٢٢.

٢) كولن ولسن، سقوط الحضارة، ترجمة انيس زكي حسن . دار العلم للملايين، الطبعة الاولى، بيروت. ١٩٥٩، ص١٤٢.

٣) د. محمد عبدالعليم مرسي، رحلة في كتاب ا.د. محمد عبدالجبار بگ مفاهيم اسلامية وغربية عن الحضارة، عرض وتحليل، مجلة (الفيصل) العدد (١١٢) السنة العاشرة، تموز ١٩٨٦ ص٧٤.

٤) رفعت سلام، التراث والتجديد المنهج في بحث الثقافة العربية، مجلة (قضايا عربية، العدد الرابع، السنة الثامنة، نيسان ١٩٨١، ص٧٨.

٥) احمد بهجت، الدين.. بين المدينة والحضارة، مجلة (النهضة). الكويتية، العدد (٩٩٩) السنة العشرون، ٢٧/ك١/١٩٨٦ ص٢٨.

هەروا مامۆستا (احمد بهجت) لەم وتاردا پێی وایە کە بۆسەر هەڵدانی ژیار ئەوا پێویستە ئایینێکی یەکتا پەرست ببێ، پاپەیوەندییەکی بەتین هەیە لەنێوان یەکتاپەرستیو ژیار. بۆ گەواهی ئەم راستیەش ئەوا نموونەی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دێنێتەوە کە چۆن لەدروست کردنی شارستانی (المدنية. لایەنی ماددی ژیانی مرۆڤ لەپێویستییەکانی رۆژانە) بەرزو بەهێز سەرکەوتوو، کەچی لەدروست کردنی ژیار هەردەسی هێناوە، رۆمانەکان دەستیان بەسەر نیوەی زەوی داگرتو پێش کەوتن و گەورەی سەردەمی خۆیان بوون، کەچی لەناسی رەوشتی ومرۆڤایەتیدا جیاوازی لەنێوان کەسێکی رۆمانیو نارۆمانیەك هەبوو، دادو دیموکراتیەتی بەناوبانگیان تایبەت بوو بەخەڵکی رۆما بە تەنها، واتە هەر چ کەسێك رۆمانی نەبوایە بەپلەیەکی خوارتر لە مرۆڤ سەیر دەکرا ودادەنرا، رۆما بۆی هەبوو ئەم کەسە بگەڕێنێتەوەو وبیفرۆشێ و بیکرێ وەك کۆیلە، کەچی ژیاری ئیسلام ئەم جیاوازیە نازانێ و بوونی نیە، جیاوازی لەنێوان عەرەبێك و ناعەرەبێك نیە، تەنها بە خۆ پارێزی (التقوى) نەبێت. ص٢٨.

٦) محمود شاكر، مفاهيم اسلامية الحضارة. مجلة (الفيصل) السعودية العدد (٧٠) شباط ١٩٨٣، ص٧٠.

٧) هشام البدراني، الحضارة والمدينة في الفكر الاسلامي، الطبعة الاولى، مطبعة الزهراء، موصل، ١٩٩٤، ص ٢٠

٨) محفوظ العباسي، الغرب نحو الدرب باقلام مفكرية، الطبعة الاولى مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٩٨٧، ص ٢٤٢.

٩) د. محمد عبدالعليم مرسي، ص ٧٦

١٠) محمد متولى ، لقاو مع الدكتور احمد شلبى، التاريخ.. والحجاره الاسلاميه، مجله (الفيل (العدد (١١٤) ايلول ١٩٨٦، ص ٣٨.

هەروەها ابو الحسن على الحسن الندوي، مذكرات سائع في الشرق العربي، مؤسسة الرسالة . الطبعة الثالثة، بيروت ١٩٧٨، ص١٠٥.

١١) محمد عبدالعليم مرسي، ص ٧٤.

١٢) محمد متولي ، لقاء مع الكتور احمد شلبي.. ص ٣٨.

١٣) محمد متولي، ص ٣٨.



# هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە

# تیمێکی پزیشکی فەرەنسی دەسەلمێنێت کەفیرعەون بەنقووم بوون لەئاودا مردووە



و/ موحسین مزیری

گۆڤاری (باری ماتش)ی فەرەنسی ئاشکرای کرد کەتیمێکی پزیشکی فەرەنسی پێکهاتوو لە (١١٢) پزیشك رایگەیاند هەروەکو قورئانی پیرۆزیش (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا ئاماژەی پێکردووە کە فیرعەونی میسر لەسەردەمی موسا پێغەمبەر (علیه السلام) لەناو ئاودا نقووم بوودو بەخنکاوی مردووە. پزیشکی ئافرەتی فەرەنسی (کریستین نیلکۆت) کەسەرۆکی تیمە پزیشکیەکە بوو ئەمەی راگەیاندو وتی (ئەوپشکنین‌و لێکۆڵینەوانەی کەلەسەر لاشەی فیرعەونمان ئەنجامداوە کەئێستا لەمۆزەخانەی میسری دانراوە. وادەردەخەن کە هێشتا دەنکۆڵەی لمی دەریایی‌و بیابانی لەسەر جەستەو پرچی ماونەتەوە).

ئەمەش راستی قسەکانی خوای گەورە دەسەلمێنێت کە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت ﴿ **فاليوم ننجيك ببدنك لتكون لمن خلفك آية وإن كثيرا من الناس عن آياتنا لغافلون** ﴾ یونس (٩٢).

شایانی باسە ئەوفیرعەونەی کە خۆی‌و سوپایەکەی بەدوای موساو لایەنگرانی کەوتن تا لێوار دەریای سوورو ئەوەبوو دەریایەکە بوو بەدووپارچەو لەیەکتر جیابوونەوە تا موساو لایەنگرانی تێدا پەڕینەوەو فیرعەون‌و سوپایەکەشی تێدا نقووم بوون‌و خنکان.ناوی (منفتاح بن رمسيس الثاني) بوو کەلەساڵی (١٩٠٠)دا لاشەی لەلایەن چەندزانایەکی شوێنەوار ناسەوە لەئۆقسور لەگۆڕێکی واد دۆزراوەتەوە کەوەکو پێویست بوونی ئامادەنەکرابوو: زانایەکانیش ئەمەیان بەوە لێکدایەوە کەمیسریەکان گۆڕیان بۆ فیرعەون ئامادەنەکردووە چونکە لەو باوەڕەدا نەبوونە کەرۆژێك لەرۆژان دەمرێت ئەویش بەهۆی ئەوەی کەفیرعەون بانگەوازی خودایەتی بۆخۆی دەکردو ئەوانیش باوەڕیان دەکرد. شایانی ئاماژەپێکردنە کەئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر داواکاریەکی زانستی فەرەنسی ئەنجام دراوە بەمەبەستی چاودێریکردنی پێویست بەتیشك‌و ئامێرە پێشکەوتووەکان بۆ نەهێشتنی هەندێك زیان کەبەسەر لاشەی فیرعەوندا هاتووە بەهۆی ئەوماوە درێژەی کەبەسەر رووداوی نقووم بوونەکەدا تێپەڕیوە کە(٤) هەزار ساڵ لەمەو بەربووە کەبێگومان ئەمانە هەموو راستی قسەکانی قورئانی پیرۆز دەسەلمێنن کەتیایدا هاتووە کە لاشەی فیرعەون دوور لەتیاچوون دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی دوای خۆی.

---

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (الرأی) ژمارە (٢٣)ی بەرواری ٥-٩-١٩٩٩.





## یەکێك لەو زیندەوەرانەی خوای گەورە لەقورئان باسی کردووە




ئیحسان تاهیر

﴿ حتى إذا أتوا على واد النمل قالت نملة ياأيها النمل ادخلوا مساكنكم لايحطمنكم سليمان وجنوده وهم لايشعرون فتبسم ضاحكا من قولها وقال رب اوزعني أن أشكر نعمتك التي أنعمت علي وعلى والدي وان اعمل صالحا ترضاه وادخلني برحمتك في عبادك الصالحين ﴾ سورة النمل ، آية (١٩)

### پێشەکی

بێگومان خوای گەورەکە دروستکەری هەموو شتێکە، هیچ بوونەوەر (مخلوق)ێکی بەبێ مەبەست دروست نەکردووە بەڵکو هەموو شتێك چ (مرۆڤ یان زیندەوەریان بێ گیانەکان) بێت مەبەستو نیازی خۆی لێ هەیە. بەجۆرێك کەهەریەك لەم بوونەوەرانەش بەتەنها جیهانێکی تایبەتی سەربەخۆیەو خاوەن چەندەها نهێنییەکە هەمووی پەندو عیبرەتن بۆ مرۆڤ بەو پێیەی کەتەنها ئەو رووبەرووی لێپرسینەوەو حساب دەبێتەوە لەدوا رۆژدا. بۆ ئەوەی بەپێی توانا چەند ساتێك بچینە ناو جیهانێکی پڕ لەنهێنی و سەیرو سەمەر کە هەر هەموویان گەورەیی خوای گەورە دەردەخەن. وابەباش دەزانین باسی یەکێك لەو زیندەوەرانە بکەین کەخوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بەبایەخەوە باسی کردووە تەنانەت یەکێك لەسورەتەکانی قورئانی پێ ناونراوە، ئەویش مێروولەیە (النمل) .

### مێروولە لای زانا بایۆلۆژیەکان:

مێروولە بەناوداترینو زۆرترین جۆرەکانی مێروو(حشرات)ەکان دادەنرێتو بەربڵاوییەکی گەورە لەهەموو شوێنێکی جیهاندا هەیە جگە لەوشوێنە زۆر ساردەکان نەبێت. مێروولە چەند جۆرێکە لەوانە مێروولەی ئاسایی‌و مێروولەی بەجەنتینی‌و مێروولەی سپی‌و چەندانی تریش. مێروولە پەیوەندییەکی توندو بەهێزی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، ئەوەتا لەماڵیداو لەشوێنی کارکردنو لەزەویەکانیدا دەبیندرێت.

سەرەڕای ئەو جیاوازیە گەورەیەی کەلەنێوان شێوەو قەبارەی مێروولەکاندا هەیە. دەتوانرێت بەئاسانی بناسرێنەوە بەهۆی ناوەندە باریكو شاخە هەستەوەرەکانیانەوە هەروەها مێروولە بەزیندەوەرێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێتو بەپێچەوانەی هەنگەوە هەر نیشنگەیەکی (مستوطنة) پادشایەك یان زیاتری تێدایە بێ ئەوەی زۆری پادشاکان لەیەك نیشنگەیەکەدا هیچ کێشەیەکدا بێنێتەوە بەڵام زۆر جار ئەم شتە دەبێتە هۆی ئەوەی کەزۆر جار ببێتە نێچیرێکی ئاسان بۆ هەندێك باڵندەو گیاندارە شیردەرو خشۆکەکان



کەپیشەی تایبەتییان ڕاوکردنو تێکدانی مۆڵگەکانیانە.

## چینەکانی مێرووڵە:

کۆمەڵگای مێرووڵە وەکو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دابەش دەکرێتە چەند چینێکەوە کە ئەمانەن:-

١- پادشاکان/ هەروەکو پێشتر باسمان کرد هەر نشینگەیەکی زیاتر لەپادشایێکی تێدایە کەمێینەن‌و ئەرکیان تەنها کرداری زۆربوون (التكاثر)ە، ئەم پادشایە لەقەبارەدا گەورەیەو نێرێکی باڵداری تایبەت بەخۆی هەیەو دوای ئەنجامدانی کرداری جووت بوون هەردوو باڵەکەی هەڵدەوەرێن.

٢- کرێکارەکان/ ئەم چینە زۆرینەی ژمارەی مێرووڵەکانی نیشنگەکان پێك دێنێت کە لەوانەیە لەنیشنگە گەورەکاندا بگاتە چەندان هەزار مێرووڵە. بەبچووکی قەبارەیان لەچاو پادشاکانی جیادەکرێتەوەو باڵدارنیەو هەموو ئەرك‌و کارەکان لەئەستۆ دەگرن، وەکو هێنانی خۆراك‌و چاودێریکردنی گچکەکان‌و دروستکردنی هێلانەو چەندانی تریش ئەم جۆرە لە (٥٢) ساڵ دەژین.

٣- سەربازەکان بەگەورەیی سەرو بەهێزی دەم‌و شەویلگە دەناسرێتەوە کەئەم پێکهاتە بایۆلۆژییەی لەگەڵ پیشەکەیدا (کەبەرگریکردنە) دەگونجێن ئەرکی ئەمانە بەرگریلێکردن‌و پاراستنی دەرگای کونەکانیان‌و مۆڵگەکانیانە لەهەموو هێرشێکی دوژمنانیان ئەم جۆرە ش باڵدارنین.

٤- نێرەکان/ ئەمانە هیچ پیشەو ئەرکێکیان نیە جگە لەجووت بوون لەگەڵ پادشایەکان کەبێگومان جووت باڵەکانی یارمەتی ئاسان بەجێهێنانی ئەم ئەرکەی دەدەن هەر بۆیەش ساڵی جارێك یان چەند جارێکی کەم بەشێوەیەکی سروشتی مێرووڵەی باڵدار لەدایك دەبێت ئەوەی جێی سەرنج‌و تێڕوانینە لەجیهانی مێرووڵەدا ئەوەیە کەهەڵوێستی نێر لەنیشنگەی مێرووڵەی سپیدا بەتەواوی جیاوازە لەمێرووڵەی ئاسایی چونکە چارەنووسی نێرینە مێرووڵەی ئاسایی هەر مردنە هەرچی مێرووڵەی سپییە ئەوا نێرەکەی دەتوانێت بەپیشەی کارکەریش هەڵبستێت بۆیە لەجیهانی مێرووڵەی سپیدا دەبینین کار کەرەکان لەهەردوو ڕەگەزی نێرو مێن.

## خۆراکی مێرووڵە:

مێرووڵە لەهەمە جۆر خواردنەکان دەخوات. ئەوەی یارمەتیدەریش بێت بۆ ئەم کارەی ئەوەیە کەلەناو کرێکارەکانیدا ژمارەیەك کارکەری تایبەت بەهەریەك لەجۆرەکانی خواردن هەیە. هەندێك لەمێرووڵەکان گیایەکان دەخۆن‌و هەندێکیشیان پیشەیان پاککردنەوەی شوێنەکانیانەو هەندێکی تر نێچیرکردن‌و هەشیانە تەنها پیشەیان کۆکردنەوەی دانەوێڵەکانە لەوانەشە هەندێك جار بەشێوەیەکی کاتی زۆربەی مێرووڵەکان بۆ خواردن پشت بەنێچیرببەستن‌و نێچیری (پێشکەو زەنگەزوورەو جاڵجاڵۆکە.. هتد) بکەن، بەڵام هەرچی سەربازەکانیانە ئەوا بەبەردەوامی پشت بەنێچیر دەبەستن هەندێکی تریش هەن کە بەشیلەی گوڵ‌و ڕووەکەکان دەژین هەندێکی تریشی هەن کەپەیوەندیەکی هاوکاری گۆڕینەوە لەگەڵ ڕووەکەکان دەبەستن بەجۆرێك کەمێرووڵەکە پارێزگاری ڕووەکەکە دەکات لەهێرشی دوژمنە جیاجیایەکانی‌و بەرامبەر بەم پارێزگاریکردنەش ڕووەکەکە جێگایێکی گونجاوو خۆراکێکی تایبەت بۆ مێرووڵەکە دەستەبەر دەکات.

هەرچی مێرووڵەی سپیشە ئەوا لەسەر حیسابی داری وشك (ئەوەی ژیانی لەبەر نیە) دەژیت. کە زۆر جار ئەو خانوویانەی لە دار دروست کراون تووشی مەترسی ڕووخان دەکات. لە وانەش هەندێك جار مەترسیەکی گەورە بێت بۆ بەهەدەر بردن‌و بێ کەڵککردنی خۆراکە وشکەکان‌و شتە دروستکراوەکان لەپێست‌و پلاستیك‌و ... هتد.

## ڕەفتاری مێرووڵە:

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەمێرووڵەدا ئەو هەموو کۆشش‌و فێڵ‌و بلیمەتیەیە کەسەرەڕای بچووکی‌و



لاوازی خۆی بەکاریان دێنێت بۆ کۆکردنەوەی خۆراکی پێویستو وگلدانەوەو پاراستنی بۆ کاتی پێویست. ئەمەو چەندان رەفتاری تر کەلەمێروولەدا بەدی دەکرێن و حەق وایە هەموو کەسێك پەندو عیبرەتیان لێوەربگریت بەڵام لێرەدا ئێمە تەنها چەند نموونەیەك دێنینەوە بۆئەوەی ببنەبەڵگەو نیشانەیەکی تری گەورەیی و بەتوانایی بێ سنووری خوای پەروەردگار:

* ئەگەر مێروولەکان ویستیان خۆراك کۆبکەنەوە ئەوا دەردەچن بۆ گەران بەدوایدا ولەکاتی دۆزینەوەیدا رێگایەکی گونجاو بۆخۆیان دیاریدەکەن ئینجا دابەش دەبنە سەر دوو بەش. بەشێکیان خۆراکەکە هەڵدەگرن و بەرەو مۆڵگەو نشینگەکانیان دەگوازنەوەو بەشەکەی تریش لەناوەندی رێگادا چاوەروانیان دەکەن بۆ ئەوەی ئەگەر بارهەڵگرەکان هەستیان بەماندووبوون کرد بارەکەیان لێوەر بگرن ولەجیاتی ئەوان خۆراکەکە بگەیننە جێگای مەبەست هەروەها ئەگەر خۆراکەکە گەورە بوو لەکونی مۆڵگەکەیان ئەچووە ژوورەوە ئەوا خۆراکەکە بۆ دووبەش لەت دەکات، بەڵام ئەوەی زیاتر لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە ئەگەر خۆراکەکە دەنکەدانەوێڵە بوو ئەوا بەشێوەیەك دەیکەن بەدوو بەشەوەکە ناوکەکەی لەناوەراستدا بکرێتە دووبەش و ئەگەر دەنکەکە دوو ناوکی هەبوو دەیکەن بەچوار بەش بەحۆرێك هەردوو ناوکەکە لەت بکرێت... دەزانن بۆچی؟! بۆ ئەوەی ئەو ناوکانەشین نەبن و نەروێن ئەگەر جارێك وا روویدا ئاو دزەی کردە ناو مولگەکەیان (جا بەهەر شێوەیەك بێت).. ئەگەر ئەم خۆراکەشیان تەر بوو ئەوا لەترسی هەمان شت دێننە دەرەوەی کونەکانیان بۆ ئەوەی بەتیشکی خۆر وشك ببێتەوەدو ئینجا دووبارە دەیگەرێننەوە جێگای خۆی.. بۆیە ئەگەر تێبینی بکەی کاتێك سەیری دەرەوەی مولگە کونەکانیان دەکرێت ئەوا لەبەردەمیدا چەندان دەنکە دانەوێڵە دەبینرێت.

* هەموو گیانلەبەرەکان هەر یەك لە باڵندەو زیندەوەرو مێروولەکان رێگای جیاجیاو تایبەت بە خۆیان هەیە بۆ قسە کردن و لە یەکتر گەیشتن کە خوای گەورە پێی بەخشیوون بۆ بەرێوەبردنی ژیانیان (ومامن دابة فی الأرض ولا طائر یطیر بجناحیه الا أمم امثالکم) (الأنعام-٣٨)

زۆر جار کاتێك مێروولەکان لە هاتووچووندان وا تێبینی دەکرێت کە لە نێوان ئەوانەی دەرۆن و ئەوانەی دەگەرێنەوە زۆر جار بەر یەککەوتن روودەدات بەڵام بە دیدو بۆچوونی زانا بایۆلۆژیەکان ئەم بەر یەککەوتنە جۆرە زمانێکی لە یەکتر گەیشتنە کە بەم رێگایە یەکێکیان زانیاری تەواو دەربارەی جۆرو چەندینەو شوێنی خۆراکەکەیان بە ئەویتر دەدات. بەڵام ئەگەر دەرکەوت کە مێروولەیەك ئەم زانیاریانەی بە هەڵە داوە ئەوا هەموو مێروولەکانی نشینگەکە کۆدەبنەوەو بە تێکرا رێکدەگەون لەسەر پارچە پارچە کردنی مێروولەکە وەکو سزایەك بۆ ئەو درۆیەی‌کە کردووە چونکە بووەتە مایەی دواخستنی کارو بە هەدەر بردنی کۆششەکانی کۆمەڵەکە بەبێ‌بیانوو.

* رویال دیکنسۆن کە یەکێکە لە زانایەکانی بواری مێژووی سروشتی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (کەسایەتی مێروولەکان) دەڵێت: بە درێژایی (٢٠) ساڵ بە بەردەوامی دیراسەتی نشینگەکان (مستوطنات)ی مێروولەم لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا کردووەو بۆم دەرکەوتووە کە هەموو شتێك لەم نشینگانەدا بە شێوەیەکی زۆر رێك‌وپێك‌و بە وردییەکی لە رادەبەدەر بەرێوە دەچێت کە مەحالە ئەم شتە لە جیهانی ئێمەی ئادەمیزاددا رووبدات. بۆ ئەمە دیکنسون نموونەیەك دێنێتەوەو دەڵێت مێروولە وەکو مرۆڤ چەند جۆرە کشتوکاڵێکی تایبەت بە خۆی دەکات.

دەڵێت بینیم کە کۆمەڵە مێروولەیەك پارچەیەکی زەوی کە رووبەرەکەی بە (١٥)مەتری چوار گۆشە مەزندە دەکرا بۆ چاندن بەکارهێنابوو. ئەم کۆمەڵە بەشێوەیەکی زۆر رێك‌و پێك کارەکانیان ئەنجام دەدا بەشێوەیەك کە هەندێکیان کێڵانیان دەکردو هەندێکیشیان گژوگیایان لادەبردو هەندێکی تریش ئەرکی پاراستنی زەویە کشتوکاڵیەکەیان لەکرمەکانی



لەئەستۆگرتبوو ﴿ ذلكم الله ربكم لا اله الا هو خالق كل شيء فاعبدوه وهو على كل شي وكيل ﴾ (الانعام -١٠٢).

## مێروولە لەقورئاندا

هەروەكو باسمان كرد خوای گەورە بەبایەخەوە باسی مێروولەی كردووە لە قورئانی پیرۆزداو لە زۆر جێگاداباسی كردووە كەئەمە هەندێك نموونەیانە:

* دەربارەی ئەو دۆڵەی كە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت (حتى اذا أتوا على وادي النمل... ) (النمل -١٨) زۆربەی زانایان دەڵێن كەوتۆتە وڵاتی شام هەندێكی تریش دەڵێن لە تائیفەو هەندێكی تریش پێیان وایە دەكەوێتە وڵاتی یەمەن

*حەزرەتی سولەیمان ( سەلامی خوای لێ بێت) گوێ بیستی دەنگەكەی بوو لەدووری سێ میلەوە چونكە خوای گەورە فەرمانی بە با كرد بوو كەهەرشتێك دەنگی لێوەبێت بیگەیەنێتە گوێی سولەیمان چونكە شەیتان و ئەهریمەنەكان ویستیان بەفێڵ وفرت لەناوی ببەن بەڵام خوای گەورە لەمەترسانی پاراست.

* سەبارەت بەناوی جیاوازیەكی زۆری هەیە هەرچەندە لەقورئاندا بە (النمل) ناوبراوە بەڵام لەزمانی عەربیدا چەندان ناوی تریشی لێنراوە وەكو (طاخية) یان (منذرة) یان (حرمب)

*مێروولە وەكو موعجیزەیەك لەسەردەمی سولەیمان پێغەمبەردا بە زمان هاتووە و قسەی لەسەر كردووە كاتێك كۆمەڵە مێروولەكانی خۆی ئاگادار كردۆتەوە لەسوپای سولەیمان پێغەمبەرﷺ، ئەویش وەكو رێزلێنانێك بۆ مێروولە رێرەوی سوپایەكەی خۆی گۆڕیوە.

* لەپێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە كەفەرموویەتی (لەسەردەمی یەكێك لە پێغەمبەرەكاندا خەڵكانێك دەرچوون بۆ پاڕانەوە لەخوای گەورە كەبارانیان بۆببارێنێت و دیتیان كەمێروولەیەك خەریكی هەمان پاڕانەوەیە، ئەوكات پێغەمبەرەكە پێیان دەڵێت: بگەڕێنەوە خوای گەورە لەبەر ئەم مێروولەیە دۆعای ئێوەی قەبوول كردووە) دەگەڕێنەوە وەئەم پێغەمبەرە سولەیمان بووە وەدۆعای مێروولەكەش بەم شێوەیە بووە (اللهم انا خلق من خلقك لاغناء بنا عن فضلك). بەم جۆرە دەبینین هەر چەندە ئەوەی گووتوومانە مشتێكە لەخەرمانی نهێنیەكانی جیهانی مێروولە بەڵام ئەمەش بەڵگەیەكی تری گەورەیی و تاك و بێ هاوەڵی و بەجوانی و حیكمەت دروستكردنی مەخلوقاتەكانە لای خوای گەورەو پەروەردگار.

﴿ هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين من دونه ﴾ (لقمان- ١١)

ئیتر كەس ماوە گومانی لەباوەڕو ئیسلام هەبێت؟

﴿ قل يأيها الناس قد جاءكم الحق من ربكم فمن اهتدى فإنما يهتدى لنفسه ومن ضل فانما يضل عليها وما أنا عليكم بوكيل ﴾ (يونس - ١٠٨)

---

### سەرچاوەكان :


١- قورئانی پیرۆز.
٢- صحيح البخاري ، تقديم، احمد محمد شاكر دار الجيل ببيروت الجزء الاول.
٣- مقدمة في بيولوجية الحشرات وتنوعها، تأليف مجموعة من العلماء ترجمة احمد لطيف عبدالسلام، القاهرة ، ١٩٨٢.
٤- مفتاح دار السعادة، ابن القيم الجوزي ، الجزء الاول ، دار الكتب العلمية ببيروت.
٥- البداية و النهاية، ابن كثير، الجزء الاول دار الفكر دمشق. ١٩٩٦
٦- الجامع الأحكام القران، القرطبي، الجزء الثالث عشر، دار الفكر، دمشق، ١٩٩٨.
٧- الله والعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٩٩٠.
٨- جريدة (الزورا ) العراقية، العدد (١٠٤)، ٣ حزيران - ١٩٩٩.






بەشی دووەم

وەرگێڕانی / حاجی سەلام کەریم
بەڕێوەبەری گشتی دیوان (بەوەکالەت)

## چـــاو

١- چـاوی کەسـانی تەمبـەڵو سسـت هەمیشـە دەرپەڕیوو گەورە دێتە پێش چاو.

٢- خـاوەنی چاوانی بەقولاچوو هەمیشە مرۆڤـی ڕاستو سیخوڕە.

٣- چاوی هونەرمەندو کەسانی جوانکار داپۆشراو مەنگ.

٤- چاوی عاشقان خەنداوىو بەزەردەخەنە.




٥- کەسانی مەنگو بێ دەنگ هەمیشە لەشێوەی دڵی یاقوتی دێتە پێش چاو.

٦- چاوی کەسانی خاوەن ئیرادەو گارامە هەمیشە بزوێنەرو بچووکە.

٧- چاوی نزیك بەیەك یان پەیوەست خاوەنەکەی بەتواناو زیرەکە.

٨- چاوی دوور لەیەك و جودا هەمیشە نیشانەی فێڵ و بەدرەفتاری خاوەنەکەیەتی.

٩- چاوی تیژ نیشانەی مەکرو فێڵ و حیلەیە.

١٠- چاوی ناهاوتا نیشانەی هەڵچوون و ئاڵۆزی رەوشتە.

١١- چاوی کەم کراوە واتە مەستو خومار نیشانەی نابرو و شەرمە.

١٢- چـاوی بچـووك نیشـانەی فێـڵ و ئازایـەتی تێدایە.

## لووت

١- خـاوەنی لووتـی گۆشـتن و گـەورە نیشـانەی زۆر خواردن و نازیرەکییە.

٢- خاوەنی لووتی لەسنور زیاد نیشانەی زیرەکیو شەیتانییە.

٣- خـاوەنی لووتـی قەڵـەمی نیشـانەی هـێزو دەسەلاتە.

٤- لووتـی مرۆڤـی وەجـاغ زادە دەروانێـت بەسـەر دەمیدا واتە لەشێوەی هەڵۆ.

٥- کەسانێك کە حەزیان بەئازادی نەبێت خاوەن لوتێکن کە هەردو کونە لووتـی (برنـاخ) فراوانـەو





بەرینە.

٦ خاوەنی لووتی کەوانە (کەج) نیشانەی لووت بەرزیو خۆ بەزل زانینە.

٧ لووتی زۆر گەورە خۆشی و دڵفراوانی و دەوڵەمەندی دەگەیەنێ.

٨ لووتی بچووك نیشانەی قسە خۆش و نوکتەبازیە.

٩ لووتی وەك دەنوکی باڵندە نیشانەی پەستی دەگەیەنێ.

١٠ لووتی نوك تیژ نیشانەی هەژارییە.

١١ لووتی چەماوە نیشانەی دەسەڵاتو توانایە.

١٢ لووتێك کە لەشێوازی دەرپەڕیودابێ نیشانەی سادەیی و خۆشباوەڕییە.

## چەناگە (الذقن)

١ خاوەنی چەناگەی کورت نیشانەی شەرمو ئابڕووە، بەڵام بەتواناو بەهێز.

٢ خاوەنی ئەو کەسانەی کەبێ چەناگەن نیشانەی رووح سووکیو لاوازی دەروون دەگەیەنێ.

٣ خاوەنی چەناگەی بۆ پێشەوە هاتوو نیشانەی حەز بە پلەو پایەو شوێن و مەقام دەکات.




٤ خاوەنی چاناگەی چوارگۆشە نیشانەی نەترسانو باوەڕ بەخۆبووە.

٥ خاوەن چەناگەی چاخ و قەڵەو نیشانەی هەوا پەرستیو ئارەزووبازی.

٦- خاوەن چەناگەی تیژ نیشانەی زوو تووڕەبوونو هەڵچوونە.

٧-٨ کەسانێکی خۆش گوزەران و ناس پەروەرن حەزیان لە هاوڕێیەتی ژنان و پلەو پایە بەرزییەوە لەکاروباری کۆمەڵایەتیدا سەرکەوتووە.

## دەم

لەلایەنی تەندروستییەوە ئەگەر باسی لێوە بکەین، دەم گرنگترە لە لووت، چونکە خواردن، سەرباری هەوا هەڵمژین، بەدەم تێدەپەڕێ ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر بەدەم فرمانو خواستەکان دەخرێنە روو ئەوەی لەبیردا هەیە دەردەبڕدرێ. بەڵام توانای دەربڕینی فرمان دەرکردن هۆیەکە وا لەدەم دەکات ببێتە رەگەزێکی گرنگ لەرەگەزەکانی کەسێتیو دەبێتە بەڵگەو هۆیەك بۆ بوونو دەست نیشان کرنی کەسێتی ئەو مرۆڤە. ئەگەر هاتوو دەمەکە گەورەو ئاشکرا بوو. ئەگەرچی دەمی گەورەش پەسەند نییە.





١) ئەو دەمەی لەشێوەی کەوانەیی (قەوس)دایە مانای بێهێزی کەسێتی دەگەیەنێ.

٢) ئەو دەمەی لەو شێوەیە بنوێنێ بەپێچەوانەی هی یەکەم مانای کەسێتی بەهێز دەگەبەنێ.

٣) دەمی گەورە کە شێوەی نیمچە چوارگۆشە وەردەگرێ، کاتێ زۆر بەفراوانی دەکرێتەوە، گەواهی بۆ رەفتاری باش، بوونی خواستو ئاواتو هەندێ بەکەمیش گوێ بەشت نەدانی ئەو کەسێتییە دەدات.

٤) دەمی توندو رێك، کە هەردوو گۆشەکانی بەرەوخوار نزم دەبنەوە، لە زانستی (سیماناسی) پێی دەڵێن (دەمی ماسی)، کە گەواهی بۆ جەربەزەییو پێداگرتنی ئەو کەسە دەدات لەو هەڵوێستانەی کە تووشی دێت.

٥) ئەم جۆرە دەمە هەردەم وشەی ناڕێك و هەست بریندارکەر بەکار دەهێنن.

٦) ئەو هێڵەی کە لەنێوان لێوی خواروو و سەروو دایە ئەگەر بەرەو خوار کەوانەیی بوو گەواهی بۆ پێداگرن (العناد)ی ئەو کەسە دەدات، خاوەنەکەی حەز بەپیاهەڵدان و خۆدەرخستن دەکات.

٧) بەڵام ئەگەر هێڵی نێوان دوو لێو کە بەرەو سەرەوە کەوانەیی بوو گەواهی بۆ بەهرەمەندی ئەو کەسە دەدات.

٨) دەمی نافرەتان، ئەگەر هاتوو نیمچە زەردەخەنەیەکی لەسەر بوو ئەوا خاوەنەکەی هەمیشە شەهوانیە، بەڵام ئەم شێوە دەمەش لەلایەن پیاوان کەمە، ئەگەر هەشبێ خاوەنەکەی هونەرمەندە.

٩) دەمێکی شێوە داروخاو، کەسێکی هێرش بەرە، جیابوونەوەی هاوسەرێتیشی لێ چاوەڕوان دەکرێت.

١٠) ئەگەر هاتوو لێوی سەروو بەرەو پێش هاتبوو کەسەکە زۆر ڕاڕا دەبێت بەتایبەتی لەلایەنی خۆشەویستی کردن، بەڵام ئەگەر لەگەڵ لێوی خوارەوە لەیەك ئاست دابوون ئەوا خاوەنەکەی توندوتیژو باوەڕی بەخۆی دەبێت.

١١) ئەگەر لێوی خواروو بەرەو پێش هاتبوو کەسەکە خۆپەرست دەبێو لەژیانی هاوسەرێتیش مایە پووچە.

١٢) ئەگەر دەم بەرەو پێشەوە زۆر تەسك ببوەوە ئەو کەسە کاریگەرە، بڕیارەکانی بەپەلە دەدات، بەڵام ئەگەر بەرەو ناوەوە (ژوورەوە) چووبوو ئەو کەسە رەزیلە.

١٣) ئەگەر دەمت بەم شێوەیە بوو لەکاروباری داراییدا زۆر تەنگوچەڵەمەت تووش دێتو زووش هەڵدەخەڵەتێی.

* هەندێ لەو روخسارە نموونەییانە کە لەژێر مێشکی (سیماناسی) باسیان دەکەین، با بیانناسین:

ئەگەر لەرێگەی هونەری سیماناسی چینییەوە لەهەندێ روخساری ناسراومان کۆڵیەوە، ئایا چیت بۆ دەردەکەوێ؟ یا هەندێ کەسێ وەربگرین:

جاکلین ئۆنانیس کە روخسارو شێوەیەکی نوێیە لە جاکلین کیندی پێشوو، هینری کیسنجەر کە ناوێکی خواستراوە بۆ هێنری (نازیز)ی راستەقینە، بریجیت باردۆ یان چلەپۆپەی سینەمای فەرەنسی (ب.ب) لەکۆتاییدا نانسی کیسنجەر کە چاوەڕوانین نازناوە رەسەنەکەی بزانین.

* **جاکلین ئۆنانسی**: روخساری (جاکی) روخساری ئافرەتێکە کە حەز لە خۆشەویستی دەکات، هەردەم پێویستی بەپیاوێك هەیە گرنگی پێبدات، کاتێ پەیوەندی لەگەڵ پیاوێ دەبەستێ دڵسۆزییەکی قووڵی بۆ دەبێو غیرەشی لێ دەکات، ئەمانە هەموو لەبرۆ نیمچە کورتەکەی دەردەکەون، بەتایبەتی لەچاوە بچووکەکانی کە پانتاییەکی زۆر هەیە لەنێوانیاندا ئەمەش پێداگرتنو راشکاویی دەگەیەنێ.



لوتی پانیشی گەواهی بۆ ئەوە دەدات کە بەدوای دەوڵەمەندیی وێڵەو پارەش لەژیانیدا بەهایەکی زۆری هەیە، هەرچی دەمی گەورەی کە بەفراوانی و بەشێوەیەکی چوارگۆشەیی دەکرێتەوە گەواهی بۆ رەفتاری باشیو حەز بە دڵخۆش کردنی خەڵك دەداتو ئەم جۆرە دەمانە بەوە دەناسرێنەوە کە بەخواستو ئاواتن، لەکۆتاییدا شێوەی لووتە پانەکەیو توندی چەناگەی پێمان دەڵێن کە (جاکی) بۆ ماوەی ٧٠ساڵ دەژین.

* **بریجیت باردۆ:** لەتوانای سیماناسی چینییەکاندا هەیە چەندین کاتژمێر تەرخان بکەن بۆ روخساری بریجیت باردۆ، دەمی (دەمی ماسی)یە کە زۆر تەنگە نیشانەی کەسێتییەکی پێداگرو بەهێزە، حەز بە خۆسەپاندن دەکات، بەڵام مایە پووچە لەهەر هەوڵێکی شووکردنیدا، هەرچی لێوە توندەکانیشییەتی گەواهی بۆ نەبوونی ریاییو درندەیی ئەو کەسێتییە دەدات، و بڕۆکانیشی بەرەو سەرەوە چوونە نیشانەی ئازاییو بوونی گیانی یارمەتییە، دوو گوێچکە بەرزەکانیشی نیشانەی ئەوەن یاخود جەخت لەسەر ئەو راستییە دەکەن کە بریجیب باردۆ هەرچی بکات بەمەبەستی ناوداریيو دەوڵەمەندیی دەکات.

هەروەها کوڵمەکانی بەرز بوونەتەوە ئەم سیفەتەش لەئافرەتاندا ئەوە دەگەیەنێ کە حەز بە سەربەخۆیی دەکات، بەڵام ئەو عەیبە سەرەکییەی کە لەروخساریدا هەیە یاخود بەدی دەکرێت کورتی کوڵمەکانیەتی ئەویش ماناي ئەوەیە کە بریجیت باردۆ دوای تەمەنی پەنجا ساڵی بەخت یاری نابێت.

* **هێنری کیسنجەر:** کوڵمە پانەکانی بەبێگومان گواهی بۆ ئەوە دەدەن کە رۆشنبیرێکی دێرینە، بەڵام لەبەر ئەوەی سەراپای روخساری بەقەد



کوڵمەکانیەتی لەگەورەییدا، مانای ئەوەیە کە هونەرمەند نییە.

سێ خەتی ئاشکرا لەسەر کوڵمەکانی دیارن کەواتە مانای بوونی ناوداریو دەسەڵاتداریی دەگەیەنن، هەرچی گەورەیی لووتیشی پێمان دەڵێ (هێنی) لووتکەی سەرکەوتنی لە ٤١ و ٤٠ساڵی تەمەنیدایە، بەڵام دوای ٥٦ ساڵی رۆژگار بۆی باش نابێ، چونکە هەردوو پەپکەی لووتی زۆر دیارو بەرچاونین، وابێناچێ ببێتە مرۆڤێکی تەواو لەهەموو شت لەبەر ئەوەی چەناگەی بەهێزو گەورەیە، تەمەنی پیری بەئارامی دەباتە سەرو لەکاروانی نووسیندا پێش دەکەوێ، بەهەرحاڵ هەندێ نیشانەی نەخۆشی لێ داری دەدەن.

* **ناسینی کیسنجەر:** کوڵمەکانی تەنگن، کەواتە ژیانی ناوماڵ ماندووی دەکات، هێڵی قژی لەسەر نێوچەوانی گرنیگرنییە، کەواتە لەمنداڵیشی دڵخۆش نەبووە، هێڵێکی راستیش لەنێو چاوەکانی بۆ تەختی نێوچاوانی بەرز دەبێتەوە کەواتە بەخت باری دەبێت.

چاوەکانی لەجۆری (چاوی فیل)ن ئەویش نیشانەی ئەوەیە کە بیرێکی بەهێزی هەیە. لوتەکانیشی وەك نێسکی ماسین کەواتە لەخۆباییيەو خۆی بەزل دەزانێو پەیوەندیشی لەگەڵ خەڵك وشکە.

هێڵەکانی خوارەوەی لووتی بەرەو خوار داشکاون ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە منداڵو وەچەی زۆر دەنێتەوە.. ئەگەر ویستیشی هەردوو لێوەکانی بەرەو سەرەوە رێك بکات کەواتە بەهرەمەندە.



# کەسایەتی مرۆڤ لەڕوانگەی ئایینی ئیسلامی پیرۆزەوە



د. عومەر یاسن جەباری / زانکۆی سەلاحەدین

ئەگەر سەرنجێکی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان بدەین دەبینین سەرجەم ئەم ئایەتانەدا داڕێژراون تێبینی هەموو لایەنەکانی ژیانی دەروونیو کۆمەڵایەتیو بایۆلۆجی مرۆڤیان بەخۆوە گرتووە سەرجەم ئەم ئایەتە پیرۆزانە ڕێنومایی و ڕێپیشاندانی تێدا بەدی دەکرێ، چونکە ئەوەی ڕوونو ئاشکرایە دیدو بۆچوونی قوتابخانەی ئیسلامی جیاوازییەکی تەواوی هەیە لەگەڵ قوتابخانە بایۆلۆجیو دەروونیو کۆمەڵایەتییەکان ئەو قوتابخانانە هەندێکیان لایەنی ویراسی لەژیانی مرۆڤ بەگرنگ دەزانن وەك بیردۆزەکانی داروینو ئەنیشتاین هەندێکیتریان لایەنی ژینگەو هەندێکیتریان وای بۆ دەچن کە سیفەتە ویراسییەکان هیچ دەستکاری ناکرێو هەندێ لایەنی کەسایەتیو هەندێکی تریان خبراتی منداڵیو رابردوو... هتد بەڵام ئیسلام قوتابخانەیەکی گشتیو شمولییە جەخت لەسەر هەموو لایەنێکی مرۆڤ دەکات هەمووی لا گرنگەو مرۆڤ بریتییە لەعەقڵو جەستەو دەروونو دەوروبەرو بۆماوە هەریەکە کاریگەری خۆی هەیە لەسەر رەفتارو کەسایەتی مرۆڤ، پەروەردەی منداڵ نەك هەر لەپێنج ساڵییەوە هەروەکو قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی باسی دەکات گرنگە، بەڵکو منداڵ هەر لەبوونییەوە لەناو سکی دایکیدا پێویستی بەبارو دۆخێکی تایبەتو گونجاو هەیە بۆ نموونە باری دەروونی دایكو باری جەستەییو تەندروستیو ئاسوودەییو مەیلو ئیتیجاهی دایكو خواردنو ماندوو بوونو حەسانەوەو زۆر شتیتر کەسایەتی مرۆڤ دروست دەکەن بۆیە پێغەمبەری مەزن ﷺ دەفەرمووێ( فأن العرق دساس)، لەدوای لەدایك بوونیش ژیانی منداڵ پێویستی بەبایەخپێدان هەیە چونکە هەر لەقۆناغی منداڵییەوە وێنەی قۆناغی گەورەیی دەکێشرێو کەسایەتی قۆناغەکانی داهاتوو دەستنیشان دەکرێ ئەو رەفتارانەی کە مرۆڤ لەقۆناغی منداڵییەوە فێری دەبێت بەگەورەیی فێرکردنی زەحمەت دەبێ بۆیە پێویستە ئەم قۆناغە بایەخێکی زۆری پێبدرێ، جگە لەمانەش ژینگەو هاوڕێ زۆر گرنگە لەلای ئیسلام هەر لەبەر ئەوەشە پێغەمبەری مەزن ﷺدەفەرمووێ(المرء على دين خليله) کەواتە مرۆڤ لەسەر ئایینی هاوڕێکەیەتی هەموو لایەنێك کاری تایبەتی خۆی هەیە لەسەر کەسایەتی مرۆڤو رەفتاری، ئایینی ئیسلامی پیرۆز هیچ لایەنێك نیهمال ناکات، بۆ وێنە قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی بایەخ بە(نەست) لاشعور دەداتو بڕوای وایە(هەست) شعور ئەوەندە کاریگەری نیەو تەنیا ۱۰/۱ کەسایەتی مرۆڤ دروست دەکاتو ۱۰/۹ ی کەسایەتی نەستە،



بەڵام قوتابخانەی ئیسلام دەڵێ مرۆڤ گیانلەبەرێکی بەئاگایەو بەهەستو ئارەزوو توانای خۆی هەموو کارێك ئەنجام دەداتو بەرپرسی هەموو رەفتارێکی خۆیەتی قورئانی پیرۆز دەفەرمووێ( ولاتزر وازرة وزر اخری) هەندێ لەقوتابخانەو بیردۆزەکانو بیروبۆچوونەکانیان مرۆڤ لەقاڵبێکی تەسك دادەنێنو دەڵێن کە مرۆڤ بەرەو تەمەنی گەورەیی چوو خانەکانی لەش بەرەو نەمان دەچنو نەخۆشییەکان بەسەریدا زاڵ دەبنو هیوای بەژیانی کەم دەکەنەوەو بەڵام قوتابخانەی ئیسلام گەشبینەو لەسەر زمانی پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمووێ(تفاءلوا بالخیر تجدده) واتە گەشبین بن بۆ کاری چاك دەیبینن، چونکە هەستکردن بەخۆشیو شادیو کامەرانی کاری رژێنەکان خۆش دەکاتو هۆرمۆنەکانیان بەرێكوپێکی دەرژێنە ناو خوێنو لەشەوەو ئەم گەشبینیو خۆش گوزەرانو قەناعەتە کاریگەری ئیجابی هەیە لەسەر کاری ئەندامەکانی لەش ئەمەش هانمان دەدات بۆ بەراستی کارکردنو دوور کەوتنەوە لەفرتو فێڵ، چونکە ئەو کەسانەی بەراستی ناژینو فێڵ لەکۆمەڵەکەیان دەکەنو کارەکانیان بەراستی ئەنجام نادەن ئەمانە نەخۆشنو پێویستیان بەچارەسەرکردن هەیەو لەروانگەی دەروونزانییەوەش فێڵباز نەخۆشی دەروونی هەیە، خودای گەورەش دەفەرمووێ بسم الله الرحمن الرحيم ﴿ يخادعون الله والذين امنوا وما يخدعون الا انفسهم ومايشعرون ﴾(٩) في قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا ولهم عذاب اليم بما كانوا يكذبون.(البقرة/١٠)ە ئەو مرۆڤەی کە خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿ لقد خلقنا الانسان في احسن تقويم) ئەم رێکو پێکیو دروستییە هەموو بوارێك دەگرێتەوە جوانورێکی بواری ئەقڵیو دەروونیو جەستەییو کۆمەڵایەتیو مامەڵەکردن لەگەڵ یەکتردا، یان موبالەغە نەکردنو زێدە ئیسراف نەکردن لەکاروکردەوەو هەڵسو کەوت نیشانەی دروستی دەروونو کەسایەتی ئاساییە بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێ( وكذلك جعلناكم امة وسطا)(البقرة/١٤٣) پێغەمبەری مەزنیش دەفەرمووێ(خير الامور اوسطها) بۆیە ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان ئیسلامو ئەم بیروبۆچوونە جیاوازانە تێبینی دەکرێ کە ئایینی ئیسلام کەسایەتێکی بەهێز بۆ مرۆڤ دروست دەکاتو تیشك دەخاتە سەر راستیو ورە بەرزیو گەشبینیو هێز لەژیانو دوارۆژیش لەبیر ناکاو داوای رەفتاری راست دەکات بۆ دونیاو دوارۆژو رەفتاری مرۆڤیش بەمردن دوایی نایێ بەڵکو ئاسەواری کرداری باش لەسەر کەسایەتی مرۆڤ دوای مردنیشی بەردەوامەو باس دەکرێ ئەوەتا ئیمامی عەلی کوری ئەبی تالیب(سەلامی خوای لەسەربێ) دەفەرمووێ( اعمل لدنياك كأنك تعيش ابدا واعمل لاخرتك كأنك تموت غدا) ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە مرۆڤ خۆشیو هێز لەکۆمەڵگاو هاورێو خەڵکانیتر وەردەگرێ لەسیفەتە جوانەکانی کەسایەتی هەرکەسێك بەشداریکردنە لەخۆشیو ناخۆشی دەورووبەری کە ئەوەش لەبەها جوانەکانی میللەتی کوردی موسڵمانە کەدابو نەریتەکانی لەسەر بنەمای هاریکاریو پەیوەندیو مامەڵە لەگەڵ یەکتردا دامەزراوە هەر لەبەر ئەوەشە پێغەمبەری موسڵمان(د.خ) دەفەرمووێ(لايؤمن احدكم حتى يحب لأخيه مايحب لنفسه) ئەوەش بۆ توندکردنی پەیوەندی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ لەسەر بنەمای خۆشەویستیو هاریکاریو یارمەتیو خۆشگوزەرانی ئەوانەش هۆیەکن بۆ چاندنی ئەمامی خۆشیو برایەتیو کامەرانی کەپێویستن بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی دروستو راستو ئاسوودەو سوود بەخش لەجیهاندا.

●



# سەروەری یاسا

مافپەروەر شێخ قاسم بەرزنجی

كاتێ سەرۆكی هێژا كاك (مسعود بارزانی) لەزۆر لەبۆنەكاندا داكۆكی لەسەر سەروەری یاساو بەرزی ئەم دەسەڵاتە دەكات دەبێ بزانین حیكمەت لەمەدا دووخاڵی گرنگن:-

یەكێكیان پاراستنی بنەمای پاكە بۆ گەردی رێبازی پارتیو بارزانی نەمرە كە هەر لەسەرەتاوە پابەند بووە بە پەیامی ئایینی ئیسلامو پەیڕەوی كردنی یاسا لەبەڕێوەبردنی كاروباری ئیداری كە دەتوانین ماوەی سەركردایەتی بارزانی نەمر لەبزاڤی رزگاریخوازی كوردستان بەباشترین نموونەی بوونی یەكسانی وە جێبەجێكردنی یاسا هەژمار بكەین چونكە بارزانی نەمر بەحوكمی شارەزایی خۆی لەهەموو بوارێكەوە خەسڵەتو رەوشتی بەرپرسو هەڵسوڕێنەرانی كاروباری دامو دەزگا ئیدارییەكانو پێشمەرگەی لەبەر چاو دەگرتو جوار چێوەی سنوورداری بۆ دائەنا بۆئەوەی كارو بەرنامەی هەمیشە بەگوێرەی یاسا بێت، گومانیش لەوە دانیە كاتێ بەرپرسێك خاوەن دەسەڵات بو بەڵام شێوەی دەسەڵاتەكەی موتڵەق نەبێ پابەندبێ بەپەیڕەوكردنی مادده یاساییەكان بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری رۆژانەی ئەوا دوور دەبێ لەپێشێلكردنی مافی هاووڵاتیو چەوسانەوەی.

خاڵی دووەمیش ئاشكرایە هەموو پێشكەوتنێكی ئیمرۆ لەسەر رووی زەمین چ لەبواری تەكنۆلۆژیا وەیا لەبواری شارستانیەتو كۆمەڵایەتی گشتی لەسایەی چەسپاندنی یاساو مافی مرۆڤە چونكە (یاسا) بنەماو دەروازەی بە پیرەوەچوونی هەموو هەنگاوێكە كەبەرەو پێش بنرێ وەهێزو توانایە بۆزاڵبوون بەسەر هۆكارە سلبیەكانی دواكەوتن هەر بۆیەش ولاتانی پێشكەوتوو رادەی جێبەجێكردنی یاسای زیاتر تیا بەدی دەكرێ لەبەرامبەر ولاتانی دواكەوتوودا.

وەئێمەی كورد ئەگەرچی گەلێكی زۆر دێرینین لە مێژوودا بەڵام چونكە هەر ژێر دەستە بووینو دوژمنانمان بە ئارەزووی خۆیانو بەگوێرەی سوودمەندی خۆیان ئێمەیان چەوساندۆتەوە بۆیە ئەو بوارەمان بۆ نەرەخساوە كە خۆمان دانەری یاسای بەرێوەبردنی كاروباری خۆمان بینو یاسای دوژمنانمان جێبەجێكردووەو حەزمان بووە كەپێشێلی بكەین وەك خۆی ئەنجامی ئەدەین بۆرزگار بوونمان لەتاوانو بتوانین لەگەڵ باری ژیانی سەردەم یاساكانمان بگونجێنین. بەڵام لەدوای راپەراندنی ساڵی ١٩٩١ وەدامەزراندنی پەرلەمانو حكومەتی هەرێم وەچەسپاندنی سیستەمی فیدراڵی بۆ هەرێمی كوردستان كاتی ئەوە هاتووە زۆر بەجیددیو كارامەیی هەوڵ بدەین هەموو هەنگاوێكمان لە سنووری یاسا بێت وەدەسەڵاتی دادوەری دووربێ لەدەست تێوەردان، تابتوانین لەسەرەتاوە بنەمای بەرێوەبردنی كاروباری ناوەوەو دەرەوەمان لەسەر بنچینەیەكی توكمەی یاساپارێزی دابرێژین بەو هیوایەی لەداهاتوویەكی نزیكدا بگەین بەریزی ئەو گەلو ولاتانەی كەبەراستی تیایدا فەرمان رەوایەو ئەو دیاردە دزێوانەی كەپاشماوەی رژێمە گەندەڵەكانو دەستكردی هەندێ مرۆڤی نەفس نزمو كاسەلێسە هەتاهەتایە بن بر بكەینو هەمیشە یاسا (سەروەربێ)








ئا: ئەحلام محەمەد عەلی

## ئیسلام ڕێز لەئافرەت دەنێت

ئـافرەت لەئیسـلامدا سـەردرای مافـە یاسـاییو مەدەنییـەکانی زیـاتر گرنگـی پێ دەدرێـتو خۆشیوسـۆزو خۆشەویسـتی پێ دەدەخشـرێت لـە کۆمەڵگای ئیسلامیدا... چونکە ئافرەت شایانی ئەوەی هەیە ئەم سۆزەی پێبدرێت، وەئەم هەستە دەربـبڕێت بەرامبەری.. بۆچی نا؟ ئایا ئـەو دایکی دلسۆز نیـە؟ یان ژنی خۆشەویست نیە؟ یان کچی بابـەزەیی نیـە؟ ونــەوەی بەراسـترین شـێوە ئـەم ڕاسـتیەمان بـۆ دەردەبڕێـت قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی خـاوێنی پێغەمبەرە ﷺ ﴿ ووصینـا الانسـان بوالدیـه حملتـه امـه وهنا علی وهن وفصاله في عامین ان اشکر لي ولوالدیك الي المصیر﴾. سورة لقمان- ئایـەت (١٤) واتـە: مرۆڤـمان ڕاسـپاردووە بـەوەی چاوی بەباوكو دایکییـەوە بێـت میهرەبان بێت لەگەڵ هـەردووکیاندا وەدایکی ئـەوی هەڵگرتووە لەسکیداو لەسەر بێهێزی خۆی بەهۆی بار داریـەوە بـێ هـێزتر بـووەو دووسـاڵی ڕەبـەقیش لەباوەشیدا بەخێوی کردووەو شیری پێداوە، جا ئـەی مرۆڤ سوپاسی من بکە یانی خوا هـەروەها سوپاسی باوكو دایکت بکەوە گەڕانەوەت یانی چارەنووست بۆ لای منە لەڕۆژی قیامەتدا

﴿ وان جاهداك علی ان تشرك بی مـالیس لـك بـه علم فلا تطعهما وصاحبـهما في الدینـا معروفـا واتبـع سـبیل مـن انـاب الي ثـم الي مرجعکم فـانبئکم بمـا کنتـم تعملـون﴾ سورەتی لوقمان ئایەتی (١٥).

واتـە. ئەگـەر بـاوكو دایکـت ناچاریـان کردیـن کەهاوتا بۆیـەزدان پـەیدا بکـەیت ئـەوا لەولایەنـەوە سـەرپێچییان لێ بکەو بـەگوێیان مەکە. بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا دەبێـت لـەدنیادا بەچاکـە لەگـەڵیاندا بجوڵێتـەوە، وەپـەیرەوی لەڕێگـەی ئـەو کەسـە بکـە کەخوا مەبەستییەتیو ڕەزامەندی خوای دەوێتو لە سەر پەیامی یەزدان وەپێتان دەڵێم کەچیتان کردووە لەژیاندا.

﴿ووصینا الانسـان بوالدیـه إحسـاناً حملتـه أمـه کرهـا ووضعته کرهـا وحمله وفصالـه ثلاثـون شهرا حتـی اذا بلـغ أشده وبلغ اربعین سنة قـال رب اوزعنی ان أشکر نعمتـك التـی انعمت علي وعلی والدي وان اعمل صالحا ترضاه واصلح لي في ذریتی إني تبت الیك واني من المسلمین﴾ سورة الاحقاف (١٥)، واتە: مرۆڤمان ڕاسپاردووە بەوەی لەگەڵ باوكو دایکیدا چاکە بکات،وە دایکی زۆر بەدژواریو سەختی ئەوی لەسکیدا هەڵگرتووەو بە سەختیش ئەوی بووەو هێناویەتە ژیانەوە، وەئـەو مرۆڤـە (٣٠) مـانگ دایکی بـەخێوی کـردووە لەسـکیداو لـەکاتی شـیر خواردنـدا. وەکاتێك گەیشت بەئاستی تێگەیشتوویيو بـەتوانایی مێشکی وبیری تەمـەنی بـووە (٤٠) سـاڵ. ڕوویکـردە خوای خۆی وتی: خوایـە یارمـەتیم بـدەو سـەرم بخـە لەسـەر ئـەوەی سـوپاس وستایشـت بکـەم بـۆ ئـەو نیعمـەتو بەهرانـەی بـەخۆم وبـاوك ودایکمـت داوە. وەچاکـە بکـەمو ڕەزامـەندی تـۆ بەدەسـت بـهێنم. وەنـەوەی بـاش وچـاکم پێببەخشـەو بیانهێنـە سـەر ڕێگـای ڕۆشـتنی خـۆت وەمـن ڕووەو بارەگـای تـۆ وەسـتاوم وتۆبـەم کـردووەو هاتوومەتـە ڕیـزی موسوڵمانەوەو باوەڕم هێناوە بەڕێگای ڕاستی تۆ.

﴿وقضی ربك الاتعبدوا الاایاه وبـالوالدین احسانـا إمـا یبلغـن عنـدك الکبر احدهمـا اوکلاهمـا فـلا تقـل لهمـا أف ولاتنهرهما وقـل لهمـا قـولا کریمـا* واخفض لهمـا جنـاح



الذل من الرحمة وقل ربي أرحمهما كما ربياني صغيرا ﴾ سـورة الاسـراء ئايـەت ٢٢،٢٣. واتــە: خـوای گـەورە فـەرمانی داوە کەبێجگـە لـەو پـەیڕەوی لەکـەس مەکـەنو بەتـەنیا خوابپەرسـتن،وەلەگـەڵ بـاوكو دایکتـاندا بەچاکە رەفتار بکەن، وەکاتێك یـەکێکیان یـان هـەردووکیان بەتەمـەنی پـیری گەیشـتن ئـەوا هــــەرگیز روویـــان لێوەرمــــەگێڕەو تەنانــــەت (ئـۆف)ێکیشیان پـێ مـەڵێ وقسـەی بـاشو چاکیـان لەگەڵدا بکە رووت شیرین بێت لەگـەڵیاندا، وەبـاڵی میـهرەبانیو سنگ فراوانیـان بـۆ بکـەرەوەو لـەخوای گـەورە بپـارێرەوە بڵـێ خوایــە بــەزەییت پێیـاندا بێتـەوەو میـهرەبان بـە لەگـەڵیاندا هـەروەکو چـۆن ئەوان بەمیهرەبانی منیان بەخێو کرد کاتێك منـداڵ بـووم؟ ﴿ ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة ان في ذلك لآية لقوم يتفكرون ﴾ سـورەتی الـروم (٢١). واتــە: یــەکێك لەبەڵگەکانی خوا ئەوەیە کەلەڕەسەنی خۆتان جووتی بۆ بەدیـهێناون یـانی هـەر لـەخۆتان ژنـی دروسـت کـردووە، بۆ ئـەوەی ببنـە هاوسەرو لەگـەڵیدا بژیـنو ژیـان ببەنــە سـەرو لـەنێوانیاندا خۆشەویسـتیو میهرەبانیو خێرو خۆشی بۆ هێناونەتەدی، وەهەموو ئەمانــە بەڵگـەو پـەندو عیـبرەتن بـۆ کەسـانێك کەبیربکەنەوە خاوەن هۆش بن.

﴿ وعاشروهن بالمعروف فان كرهتموهن فعسى ان تكرهوا شيئا ويجعل الله فيه خيرا كثيرا ﴾ سورەتی النساء ١٩. واتە بەرەفتارێکی چاكو باشو پەسـەند هەڵسو کەوت بکەن لەگەڵ ژنەکانتاندا. سورەتی البقرة ٢٨٨.

﴿ ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف وللرجال عليهن درجة والله عزيز حكيم ﴾ واتـە: هـەروەکو چۆن دەبێت ژن گوێ رایەڵی مێردەکەی بێتو سەرپێچی نـەکات لـەکاری چاکەدا، ئاواش دەبێت پیاو ڕێـز لەژنەکـەی بنێتو بەخێوی بکـاتو ئازاری نـەدات. وەبـەرەفتاری باش وپەسەند لەگەڵیدا بجوڵێتەوە.

واتــە: ژنــەکانتان لای خۆتـان رابگـرنو ژیـان لەگـەڵیاندا بەرنەسـەر بەچاکـەو رەفتـاری بـاشو پەسـەند، وەیـان ئازادیـان بکـەنو رێگایـان بـدەن بەجیابوونەوەو هـەڵبژاردنی ژیانی تایبـەتی خۆیـان بەتـەلاقدان،بـەلام دەبێت بەرەزامـەندیو پەسـەندی هەردوو لایەن تەلاقەکـە جێبـەجێ بکرێـتو ئـازار بەژنەکە نەگەیەنرێت.

هـەروەها ئـافرەت جێگاو پلەیـەکی بـەرزی هەیـە لەسونەتی پێغەمبەر ﷺ هەروەکو چـۆن لـەقورئاندا پلەیـەکی بـاڵای هـەبوو، وەکـاتێك سـوننەت باسـی ئـافرەت دەکـات وپلـەو شـوێنی کۆمەڵایـەتی روون دەکاتـەوە، رێـزو خۆشەویسـتی وگرنگـی خـۆی پـێ دەبەخشێت... بەتایبەتی لەو کاتەدا کەباسـی دایكو ژنو کچ دەکات.

ئا ئـەوەتا پێغەمبـەری خـوای ﷺ لـەکاتێکدا لـە (حجة الوداع) واتـە حـەجی ماڵئـاواییدا روو دەکاتــە موسوڵمانانو لەوتارە مێژووییەکەیدا ئەوشتانەیان بۆ جێگـر دەکات کەدەترسێت لـەدوای خـۆی لەدەسـتی بـدەن، کێشـەی ئـافرەت دەکـات بەیـەکێك لەکێشـە گرنگـەکانو موسـوڵمانان لەوبارەیـەوە رادەسـپێرێت ودەفـەرموێت ﴿ فأتقوا الله في النسـاء ، واسـتوصوا بهن خيرا) واتە: لەرەفتارکردن وهەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانتاندا هەمیشە لە یادی خواو پەیڕەوی کردنی لەپەیامی خوابن وە لـەو بارەیـەوە فەرمانـەکانی خـوا جێبـەجێ بکـەنو رەزامـەندی ئـەو بەدەست بـهێنی، وەبەداد پەروەری وراستیو رێكو پێکیو خێرخوازی، مافی ژنەکانتان بپارێزن وەرەفتاریان لەگەڵدا بکەن.

ئائـەوەتا لەشـوێنێکی تـردا دان دەنێـت بەپلـەو مـەقامی ئـافرەتدا لـە لای خۆی.. وەجێگای ئـافرەت دیـاری دەکـات لـەژیانی خۆیـدائیمـام جعفـر کـوڕی مەحەمەد الصادق، کەنەوەی پێغەمبەرە دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەری خوا فەرموویـەتی (من اخلاق الانبيا حـب النسـاء ). واتــە: یـــەکێك لەڕەوشـــتەکانی پێغەمبـەرانﷺ خۆشەویسـتی ژنانـە هـەروەها لێـی دەگێڕنـەوە کەپێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی (ما اظن رجلا يزداد في الايمان خيرا الا ازداد حبا للنساء) واتـە: هەرکەسـێك لـەبڕواداری وخواناسـیدا بـەرەو پێـش



بچێت وقوڵ بێتەوە، ئەوا بێ گومان ئافرەتی خۆش دەوێت ورەفتارو هەڵس و کەوتی لەگەڵ ژنی خۆیدا دروست تر دەبێت.

پیاوێك هاتە لای ئیمام الصادق فەرمووی (ان صاحبتی هلکت وکانت لی موافقه وقد هممت ان اتزوج)، واتە: ئافرەتێك هەبوو دۆستم بوو، وە ئەویش حەزی لێدەکردم وخۆشی لێم دەهات، بەلام مرد، وەمن نیازم وابوو بیخوازم، ئیمام الصادق پێی فەرموو (انظر این تضع نفسك ومن تشرکه في مالك وتطلعه علی دینك وسرك، فان کنت لابد فاعلا فبکرا تنسب الی الخیر والی حسن الخلق).

واتە: سەیرکە چۆن خۆت سەیر دەکەیت وخۆت لە چ ئاستێکدا دادەنێت کێ دەکەیت بەهاوبەشی ماڵو سامانت،وەنهێنی خۆتی لا ئاشکرا دەکەیت، جا ئەگەر دەتەوێت ژن بخوازیت ئەواکچێك بخوازە کە خێر خوازبێت ورەفتاری باش بێتو لەخێزانێکی باش و رەفتار بەرزو بڕوا داربێت.

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (ئەی پێغەمبەری خوا بەکێ چاکە بکەم؟ فەرمووی (أمك) واتە دایکت. وتی پاشان بەکێ؟ فەرمووی (امك) واتە دایکت، وتی پاشان بەکێ؟ فەرمووی (اباك) واتە: باوکت.

وەدەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ خوشکێکی شیری هات بۆ لای، وەکاتێك تەماشای کرد زۆر خۆشحاڵ بوو، وەعەباکەی سەرشانی خۆی بۆ داخستو ئەوی دانیشاند لەسەری، وەکەوتە گفتوگۆکردن لەگەڵیداو زەردەخەنەی بۆ دەکرد، پاشان هەستاو رۆیشت، وەبرای ئەو خوشکە شیریەی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەلام بەهەمان شێوە رەفتاری لەگەڵدا نەکرد، یەکێك لەوانەی لەوشوێنەدابوون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی بەهەمان شێوەی خوشکەکەی رەفتارت لەگەڵدانەکرد لەکاتێکدا ئەم پیاوە؟ فەرمووی: (لانها کانت ابربوالدیها منه)واتە: چونکە ئەو لەم باشتر بوو بۆ باوك ودایکیو رەفتاری باش بوو لەگەڵیاندا ئەبو خەدیجە لەئیمام الصادق دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی:پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: من کچێکم بەدنیا هات، وە بەخێوم کرد تا ئەو کاتەی بالق بوو، هاتم جلو بەرگو خشڵە کانیم لەبەرکردو هێنامە لێوار بیرێك وپالم پێوەنا بۆ ناو بیرەکە، وەدوایین وتەیەك لەوم بیست دەی وت: ئای باوکە!!، جا کەفارەتی ئەو کارەم چیە؟ فەرمووی: ئایا دایکت ماوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی پورت ماوە؟ (خوشکی دایك)، وتی بەلێ، فەرمووی: بڕۆ داوای لێ خۆش بوونی لێ بکەو دەرحەقی چاکە بکە، چونکە ئەویش لەجێی دایکتەو لێت خۆش دەبێت لەوکارەی کردووتە، ئەبو خدیجە وتی: لەابی عبدالله ... (ئیمام الصادق)م پرسی:

ئەوە کەی بووە؟ فەرمووی لەسەردەمی جاهیلیەتدا بوو، لەوکاتەدا کچانیان دەکوشت لەترسی ئەوەی بەدیل نەگیرێنو لەناو هۆزێکی تردا منداڵیان ببێت.

ئیمام الصادق دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك سێ (٣) کچ یان سێ (٣) خوشك بەخێو بکات ئەوا بەهەشتی بەدەست هێناوە لێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر دووان بوون؟ فەرمووی: دووانیش، وەلێیان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر یەکێك بوو؟ فەرمووی یەکێکیش لەئیمام ابی الحسن الرضا دەگێڕنەوە کەفەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە زیاتر بەزەیی بەئافرەتدا (مێینە) دێتەوە تاپیاو (نێرینە)، هەر پیاوێك خۆشییەك بخاتە دڵی ئافرەتێکەوە کە مەحرەم بێت بۆی، ئەوا خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا دڵی خۆش دەکات.

ئەمانە کۆمەڵێك دەقو تێگەیشتنی ئیسلامی بوون کەباسی ئافرەت دەکەنو بانگەواز دەکەن بۆ رێزنان لەئافرەتو نوقمکردنی لەدەریای هەستو سۆزی خۆشەویستیومیهرەبانیو سەرپەرشتی کردنو گرنگیپێدان، بەشێوەیەك کەلەسێبەری هیچ



شارستـانێتیو بنــەڕەتو کۆمەڵگایــەکی تــ. ! وەهــا بارودۆخێکی بەخۆیەوە نەبینیوە

جا ئەمانــەی خستمانە بـەر جاوتـان نـامۆنین بـۆ گیانی ئیسلام، وەهەڵوێستو تێگەیشتنو نرخەکانی لەبارەیەوە بۆمان دەدوێن... جونکە ئیسلام هاتۆتـە کایەوە بۆ پاراستنی مافـەکانو ڕێزنـان لەئادەمیزادو راخستنی باڵی میهرەبانی لەسەرانسەری زەویدا.

﴿.... وما أرسلناك الا رحمة للعالمين...﴾

واتە، ئێمە تۆمان ناردووە بۆئەوەی خێرو خۆشی بیــت بۆهــەموو جیــهانیان. لەبــەر ئــەم هۆیــەش دەبینینن کەلەو دەقانەی پێشکەشمان کرد، کاتێك باسی ئافرەت دەکات دایكو ژنو کچو خوشكو وەهەر ئافرەتێك ئەوپلـەو گرنگییـە دەدات بـەئافرەت وەدان لەسـەر ئـەوە دادەگرێـت کەئافرەت خوشکی پیـاوە، وەشـــایانی میـــهرەبانی وچاکـــەو بــــەزەییو خۆشەویستنە... وەپێش ئەوەی بەنێرینە راسپێرێت بەمێینە رادەسپێرێت کەلەگەڵیدا میهرەبانی بکرێتو مــرۆڤ ڕەچـاوی بکـات، وەخـۆش ویستنی ئـافرەت دادەنێـت بەدیاردەیـەك لـە دیاردەکـانی بڕوابێنــان (الایمان)، نـەك تــەنیا ئەمــەش. بـەڵکو ئـەو خـۆش ویسـتنەی بــەرز کردۆتــەوە بــۆ پلــەی ڕەوشــتی پێغەمبەران. وەژن ئەمیندارو رازگری پیاوە لە ماڵو ئایینو نهێنیدا....

(مافە کۆمەڵایەتیەکانی ئافرەت)

لەسەرچاوە گرتنــەوە لـەم بنەڕەتانــەوە ئیسلام مافێکی یەکسانی داوە بەئافرەت کەبەسکانە بە مافی پیاو، مەگەر لەو حاڵەتانــەدا نـەبێت کەپەیوەندییان هەیە بە سروشتی تەکوینی لەشیو دەروونی جنسی یان شوێنی کۆمەڵایەتییەوە.

وەئیسلام ئەمانەی داوە بەئافرەت

١ مافی خوێندن، تەنانەت کردوویەتی بەئەرکێکی سەرشانی ئافرەت بە هەمان شێوەی پیاو بەتـەواوەتی ... ئەوەیە کەلەفەرمودەی پـیرۆزدا هـاتوو: (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) یانی هـەوڵدان بۆ بەدەست هێنـانی زانستی ئەرکە لەسـەر هـەموو نێرو مێیەکی موسوڵمان.

٢- مـافی کـارکردن: بەهــەمان شــێوەی کەئــەم مافەی داوە بـەپیاو، ئـەوا مـافی کارکردنیشی داوە بەئافرەت، وەهەر یەکێك لەکارەکانی بەلای شەرعەوە ڕێگایـان پـێ دراوەو پیاو بـۆی هەیـە بیانکـات. ئـەوا ئافرەتیش لێیان بێ بەری نیەو دەتوانێـت ئـەنجامیان بدات، وەهەرگیز لەشەرعدا کـارێك نیـە کـە بۆ پیاو ڕێگا پێبدرێـتو لـەئافرەت قەدەغە بکرێت، جونکـە هەروەکو ئاشکرایە ئیسلام لەتەشریعەکەیدا جیـاوازی ناکات لەنێوان پیاوو ئافرەتدا، بەڵام ژنی بەشو (شوی کردبێــت وەمــێردی هــەبێت) بــەبێ ڕەزامــەندی مێردەکــەی نــاتوانێت کاربکــات، جونکــە مــافی هاوسەرێتیو سیستەمی خێزان داوا لـەئافرەت دەکات کــەژیانی خــێزان بپــارێزێتو گرنگــی بــدات بەئەرکەکانی هاوسەرێتی...

٣ مافەرامیارییەکان: ئەم مافە بەتـەواوەتی دراوە بـەئافرەت، تـەنیا لـەوەدا نـەبێـت کـەبۆی نیـە ببێــت بەسـەرۆکی وڵات، هــەروەها بـۆی نیــە ببێتــە قــازی لەدادگاکاندا، ئـەگینا بەشداری دەکات لەهـەڵبژاردنی (دیــــاریکردنی) ســــەرۆکی وڵات ونوێنـــــەرەکانی نەتــەوەدا،وەبەشـداری دەکـات لـەچالاکی رامیــاریو کۆمەڵایـەتیدا، بەهــەمان شــێوەی پیــاوان، ئەوەیــە کەبۆی هەیە لە وەزارەتو پەرلـەمانو پلە رامیارییـە جۆراو جۆرەکاندا کاربکات و چالاکی هەبێت...

قورئـانی پیرۆز باسـی پـەیمانی ژنـانی موسـوڵمان دەکات بۆ پێغەمبـەری خوا ﷺ لەلایەنگیری کردنی. وەمێژووی ئیسلام ئـەوەمان بـۆ دەگێڕێتـەوە کـەژنان بەیعـەتی (پـەیمانی) پێغەمبـەری خـوا، خەلیفـەکانی پێغەمبـــەریان کـــردووە لـــەدوای کۆچـــی دوایـــی پێغەمبەرﷺ لەلایەنگیری کردنیان لەفەرمانڕەوایەتی موسوڵماناندا.

**﴿ يا أيـها النـبي اذا جـاءك المؤمنـات يبـايعنك علـى ان لايشركن بالله شيئا ولا يسرقن ولايزنين ولا يقتلـن اولادهـن ولاياتين ببهتان يفترينه بين ايديهن ولا يعصينك في معـروف**



فبايعهن واستغفر لهن الله ان الله غفور رحيم﴾ سورەتی الممتحنة (١٢).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتەی ئافرەتە بڕوا دارەکان دێن بۆ لای تۆو پەیمانت لەگەڵدا دەبەستن ولایەنگیری لەئیسلام دەکەن، وەپەیمانەکەیان بەم جۆرەیە/هیچ هاوتایەك بۆخوا دانەنێت، دزی نەکەن. زینانەکەن.منداڵەکانیان نەکوژن. وبوختان نەکەن بۆ ئەو منداڵەی لەسکیاندایە لەکاتێکدا هی مێردەکەیان نەبێت، بەدرۆ بڵێن هی ئەوە. وەلەکاتی سك پڕبوونو نەخۆشی ژنانەدا راستی بەمێردەکانیان بڵێن، وەهەرگیز سەرپێچیت نەکەن لەکارو گوفتاری چاکەدا جاکاتێك وەها پەیمانێکیان پێدایت لەتۆش پەیمانیان لەگەڵدا ببەستەو لەخوای گەورە بۆیان بپارێردوە وەخوای مەزن بەخشندەیە ومیهرەبان

تەنانەت بەهەمان شێوە بەیعەت ئەرکی سەرشانی پیاوەو پێویستە لەسەری بیکات. ئەوا ئافرەتیش پێویستە لەسەری کەبیکات... کەبریتییە لە دانان بەولایەتی شەرعی سەرۆکی نەتەوەو ئیمامەکەی و پێشەواکەی.

٤- مافە مەدەنییەکان: ئیسلام مافی یاسایی تەواوی داوە بە ئافرەت. وەکو پیاو ئەوەدەبە بۆی هەیە خاوەنداریێتی هەبێت، بفرۆشێت. وەبکرێتو ببەخشێت، وەپەیمانەکان ببەستێت. هتد

کەواتە ئافرەت بەلای ئیسلامەوە شەخسیەتی یاسایی سەربەخۆی هەیە، وەخودێکی راوەستاوو سەربەخۆی هەیە، سەربەخۆیە لە باوكو مێردو کەسانی کە، وەبەم شێوەیە ئیسلام هەموو مافەکانی داوە بەئافرەت. لەو لایەنانەوە بەهەمان شێوەی پیاو رەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات.

---

**سەرچاوەکان**

١- المرأة المسلمة في العصر الحديث.
٢- خێزانی موسوڵمان.
٣- ئافرەت لەقورئاندا

# هەوڵدان بۆ پەیدا بوونی سامان و مامەڵە پێکردنی بەپێی یاساو رێنمایی ئیسلام

**دەرباز حەمەد مستەفا کۆیی**

جیهان بە کوردەواری خۆشمانەوە پڕیەتی لەقسەو پەندو رای جۆراو جۆر کەلەژیاندا ئادەمیزاد دەکرێ سوودی لێ ببینێو زیان بەکەسی تر نەگەیەنێ بەتایبەتی ئەمڕۆ بەم شێوەیە بینراوە کە رۆژێ لەرۆژان باوو باپیرانمان چاوەڕوانی بوون. سەرەڕای ئایەتەکانی پەروەردگاری گەورەو مەزنو فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (محەمەد ﷺ) زۆر رایی گرنگ هەیە کەمرۆڤ زۆر لەلەکاتەکانی ژیاندا دەرسی لێ وەرگرتووەو هەندێ جاریش بەداخەوە بەپێچەوانەوە بووە. یەکێ لەو قسانەش لەبارەی سامانوماڵی دونیاوە کراوە کەدەڵێ .. (ژیان مەکرە بۆ ئەوەی بیخۆی بەڵکو بخۆ بۆ ئەوەی پێی بژی). بەڵام کوا کێ لەئێمە ئەم رایە پەیڕەو دەکات؟! کێ تائێستا حەقی بەژیان داوە، تەنانەت بەشێك مافی کەسی تریش پێشێل دەکەن کەواتە مرۆڤ ئەگەر سوودی خۆیی‌و لەهەمان کاتدا سوودی گشتی بوێ هەر گیز نابێ پێ لەهەقی کەسی تردا بگرێ وەبۆ پارێزگاری کردن لەشیرازەی ژیانێکی ئاسوودە نابێ یاسای ئیسلام فەرامۆش کەین یاخود ئەگەر هەستمان بەبوونی جۆرە سامانێك کرد نابێ بۆ بەرژەوەندی خۆمان کەسانی تر لەیادکەین لەهەموو روویەکەوە، بەڵکو دەبێ هەمیشە ئاگاداری دەورووبەرانی خۆمان بینو ئەوان نەبن بەرەحمەتی ئەم ئاگرە بەسوودی ئێمە، کەچی بەداخەوە جا ئەگەر شتێك بەرژەوەندی خۆمانی تیابێت چۆن



هەوڵ دەدەین کەسی تر ئاگاداربێ هەردنەوە بەسە کە دەڵێن دەی دەی کەیفی خۆیەتی! جانەگەر شتێکمان کەوتە دەست لەماڵو سامان چۆنی یاری پێ بکەین بەخێر؟ یانەوەتا خۆمان لەسەر کەسانی تر پێ هەڵدەکێشین کە گرنگترین مامەڵەکردن بەسامان دەسگرتنی هەتیوو بێوەژنە کەبەگەورەترین خێر بۆی دەنووسرێ، بەڵام ئەوەش با بەقوربانی ئێوەبێ جگە لەکەسانێکی خێرخواز کێ یارمەتی دەبەخشێ؟ جگە لەحکومەت ولاتی خۆمان ناوبانگە لەم جۆرە مامەڵە پێکردنە بەسامان هەرچەندە شتێکی ئاساییە تابتوانێ هەوڵ بۆ سامان دەدات بەدوای خۆشیو بەختەوەریدا دەگەرێ.. بەڵام زۆر جار کار لەوە دەرچووەو هەمان بەختەوەری شتی تری بەدوای خۆیدا راکێشاوە، کەواتە ئەم جۆرە خۆشیو بەخەتەوەریە بۆچیە؟! کەلەلایەك لەیاسای ئیسلام دەرچووەو لەلایەکی ترەوە مرۆڤ دەخاتە ژێر باڵی بێ ئۆقرەییو وشڵەژاویەوە. (شوبنهاوەر)ی زانا وتوویەتی (بەختەوەری وەزعێکی سلبییە) نەی کەواتە ئەوانەی واباوەر دەکەن بەقسەی (شوبنهاوەر) لایەنێکی گرنگی ژیانیان نەکردووە بەگەران بەدوای بەختەوەری یاخود شتی تر؟ یان ئەوانەی لەگەڵ ئەم رایەدانین تائێستا بەختەوەری بەردو ژێر زەوی نەبردوون، توانیویانە والەساماان بکەن هەموو دەم لە ئامادەباشیدا بێ، باشە بۆچی هەموو شتێ بکەین بەماددیو خۆشەویسترین کەسانمان لەیادکەین کەخوای گەورەو پێغەمبەرە ﷺ؟

ئەوەتا قورئانی پیرۆز کەدیاری خوای گەورەیە هەموو ئەم جۆرە هەڵوێستە سادەو ساکارانەی باس کردووە کەوا ماڵو سامان شتێکی نەبەدی نیەو بەبەردەوامی هانی مرۆڤ دەداتو بەئاگای دەهێنێ کەوا لەدڵو دەروونەوە دووربکەونەوە لەخۆشەویستی پارەو سامان هەوڵی کەڵەکە کردنو عەمبار کردنی نەدەن، چونکە ئەمە ماڵی کەس نیەو هەر رۆژە لای یەکێکە واتە بۆ کۆکردنەوە نیە بۆ ژیانو چاکەو خێرو شتی لەمەیەو خوای گەورە لەسەریەك نانی بەناپەسندو قەدەغە داناوە ئەمە بێ ئاگایی مرۆڤ رادەگەیەنێ لە بەرامبەر پەروەردگاردا.

هەروەك باسیشمان کرد چاکە لەبەرامبەر هەتیوو بێوەژن زۆر گرنگو گەورەیە پێ داگرتنی لەدوا رۆژدا سزایەکی توندو گەورەیە کە لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ **كلا بل لاتكرمون اليتيم* ولا تحاضون على طعام المسكين* وتأكلون التراث اكلا لما* وتحبون المال حباًجماً** ﴾ الفجر ١٧ ٢٠.

واتا خوای گەورە سەیری شێوەتان ناکات بەڵکو کردارتان بەرامبەر هەتیوو بێوژەنو بێ دەسەڵاتو خۆشەویستی سامان لاتان بەهەق پێ داگرتنی ئەوان.

بۆیە بەتایبەتی لەوڵاتی خۆمان یاخود وڵاتە هەژارەکان دەسگرتن بەباڵی هەتیو زۆر لەدەسگرتن بەباڵی سامانو هەوڵدان بۆ بەرژەوەندی بێوەژەنو لێ قەوماو زۆر لە هەوڵدان لەپێناو دەوڵەمەند بوون چاکترە. چونکە سامان ئەوەندی نەهێناوە ئەوەندەش ناهێنێ تا یارمەتی پێ بدرێ باشترە نەك لەوەی لەرابواردن سەرف بکرێ یاخود بخرێتە گەنجینەی هەمیشەی بێ چاکەو دووربوون لە دروست بوونی نووکتەو گاڵتە سەیر سەیرەکانی بواری خۆشەویستی ماڵو سامان کەچەندین کەسانی نزیکییەکی لەیەکتر دور خستۆتەوە یاخود دوو کەس گیانی بەگیانی بوونە لەکاتی دەوڵەمەند بوونی لایەکیان ئەوەی تری نەناسیوەتەوە یاخود لەزۆر کاردا بەیەکەوە بوونەیان بەیەکەوە زۆر رووداویان بەسەردا هاتووە بەڵام وارێك دەکەوێ لەگەڵ دەوڵەمەندبوونی یەکێك لەم دوانتە جارێکی تر ئەوی تر ناناسێتەوە.

بەڵێ ئەمەش هەمووی سامانە کەهەرگیز نەدەبوا چاوەرێی ئەم شتانەی لێ بکرایە کەهەموو هەوڵو توانای مرۆڤی لەبار بۆ ئەوەیە شتێکی دەسکەوێو لەیەکێکی تر دەوڵەمەندتر بێ کەئەمەش تەنیا باوەر رۆڵی خۆی تیادەگێری وچۆن لەژیاندا باوەرت نەبوو بەشتی چاکە مامەڵە لەگەڵ ساماندا بکەیتو بۆت مەیسەر نەکرا، لەکۆتایی تەنیا خۆت تیایدا بەر پرسیاری...



تویژینەوەی فیقهی ئیسلامی

# هۆکارەکانی جیاوازی بۆچوونی زانایان لەفیقهی ئیسلامیدا

ئەڵقەی چوارەم

عەبدوللەتیف بامۆکی

هەتا ئەو جێگایە گەیشتین کەتەنها پێغەمبەر پارێزراوە، خودا خۆی بەڵێنی داوە بەپاراستنی، پاش ئەو، هەموو کەس ئەگەری هەڵەی هەبەو ئایینی ئیسلام زادەی بیرو هۆش و ژیری نییە سروشیی خودایە، ئێمەی موسڵمانی کوردی سەدەی یازدەهەمی کۆچی، ئێستەش پابەندین پێی و هەموو ئەو ئاڵوگۆڕەی کەهاتووە بەسەر فیقهی ئیسلامیدا و لەهەندێ شوێنی ولاتە ئیسلامیەکان یاسای دەستکرد جێگەی بە فیقهی ئیسلامی تەنگ کردووە، و زۆربەی یاساکانی بەتایبەتی ئەوانەی راستەوخۆ بەراشکاوی لەگەڵ مرۆڤی سەردەم مامەڵە دەکات لەئیسلام وەرنەگیراوە وەك سەرچاوە هەرچەندەش هاو دژ بەیەك نییە، وەك یاسای هاتو چوون، رێگەو بان، پیشەسازی و نەوباو، شارەوانی، باج و زەوی، تۆمارکردنی خانووبەرەو تەندروستی، دەزگاکانی نێو دەوڵەتی و سنووری دیاری و ئاڵاو پەرچەمی سەربەخۆیی نیشتمانی، یاسای ناسنامەو رەگەزنامەو تۆمارکردنی لەدایك بوون و گەلێ یاسای گرنگی رۆژانە کەزادەی بیرو بۆچوونی مرۆڤەو بەئەزموون و تاقیکردنەوەو هەموارکردن ساڵانە گۆڕانکاری بەسەردادێ و هیچ زیانێك بەئایین و ئیسلام و مرۆڤ ناگات بەڵام لەڕووی فیقهی ئیسلامیەوە پرسیار لەزانای کوردی ئەمڕۆ دەکرێ هۆکاری جیاوازی لەناو زانایاندا حیە؟ و بۆچی لەسەر یەك بیرورا ساز نابین و بەهەمان شێوەی یاسای دەستکرد؟ یان بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ جیاوازی نەبوو یان کەم جیاوازیی لەنێوان یاراندا هەبوو؟

## کەم جیاوازی لەناو یاراندا:

راستە ئەو هەموو بەڵگانەی پێشوو ئەو پرسیارە ئاڵۆزە دێنێتە گۆڕێ، ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین: هۆکاری فرە هەیەو لەهەموو گرنگتریان:

١- هەموو موسڵمان لەیەك هەرێمی نەپچڕاودا بوون لەڕووی سروشتی، رەگەز، زمان، نەتەوە، مێژوو، ئەدەب و وێژە،کەلتوورو باری دەروونی، پێوانەی خاکەکەش کەم بوو لەکاتی پێشەوایانی راشدین لەبەر ئەوە کۆبوونەوەیان، یەك دەنگیان، هەستکردن بەمەترسی دوو بەرەکی و پەلاماری دەوروو بەریان کاری خۆیان کردبوو لەسەر ئەوە یەك بن، جیاوازی و ناکۆکیان کەم بێت، هەموو کارەکان لەنێوان دەکەس و زیاتر بڕیاری لەسەر دەدرا، راپرسی و هەمە پرسی گشتی باوی نەبوو.

٢- یاسای شورایان هەبوو کە لەگەورەپیاوانی ناوداری یاران پێك هاتبوو لەیەك نزیك و خەلیفەو شارو هەرێم و یەکتر ناس بوون، رۆژانە پرس و رایان بەیەکتر دەکردو جیاوازی زۆر کەم بوو لەم سەردەمەدا.

٣- رووداوەکان و کێشەکان و گشت گرفتەکان بەتایبەتی لەشاری مەدینەو مەککە زۆر کەم بوو ئاڵۆز نەبوو، نامۆو ناگرن نەبوو، سەرگەرمی پتەو کردنی دەسەڵاتی ئیسلام بوون لەمەرزی نێوە

دورگـەی عـەرەبی، مەترسـی هـێرش و پـەلاماری دەرەکیان هەبوو.

٤- گێرانــەوەی فــەرمووده زۆر کــەم بــوو، وەك هەڵبەسـتنی فـەرموودە هـەر نەبووکـە زۆربـەی جیاوازییـەکان لـەدەقی فـەرموودەو راڤـەکردنیو ئاڵوگۆری رستەو دەستەواژە وشەکانو هەندێ جاریش دانـانو هەڵبەسـتن هۆکاری گەورەیی جیـاوازی بـوو لەپاش ئەم سەردەمە.

٥- یاران رەزاو رەحمەتی خودایـان لەسـەر بێ زۆر هێمنو لەسەرخۆ بـوون لـەدەربرینی راوبۆچـوونو هەرگیز پەلەیان نەدەکرد لەبڕیاری سەرنویشت سازی خۆیانو ئایینەکەیان.

لەوانە گرنگتر ئەوە بوو رامیاری شوێن کەوتوویی فیقهی بوو وەك چـەرخی رەگـەز پەرسـتی ئەمـەویو عەباسیو میرو کاربەدەستانی ئەوانە نەبوو کە فیقهی ئیسلامی پاشکۆی رامیاریو ئارەزووی رەهـای فـەرمان رەوا بێــت هــەروەك پێغەمبــەر(د.خ) پێشـــبینی فــەرموودە(الخلافــة بعــدی ثلاثــون) ئـــالێرەدا زاراوەی(الامة الاسلامیة) کە لەئایەتی(کنتم خیر امة) وەرگیراوە،کالاَ لەقەد باڵایـەو راسـتو رەوان لـەدڵیدا دەچەسپێت. دەنا پاش ئەوەی پاشاکانو میرەکان دوور کەوتنـەوە لەئیسـلامو نەتـەوەکان موسـڵمان بـوونو بـەچاوی سـووك تەماشـای بـەندەو کۆیلـە دەکـرا کەزۆریان غـەیرە عـەرەب بـوونو بـەچاوی سـووك تەماشای رەشایی خەڵکە پاكو موسڵمانەکە دەکرا ئەو زاراوە مانای خۆی لەدەست داو نەتەوەی موسڵمان نیە بەڵام ئایینی ئیسـلام، دەوڵـەتی ئیسلام/ نەتـەوەکانی موسڵمان هەیەو هەتا مرۆڤ هەبێ ئیسلام هەیە، ئەم وشەیە توێنرانەوەو کوژاندنـەوەو زاڵبوونـی لێهەسـت دەکرێو تەنها بەمەبەستی رەگەزی زاڵ بەکار هاتووەو هیـچ حسابێك نـەکراوە بـۆ نەتـەوەی بچـووكو ژێـر دەست.

## فیقهی ئیسلامی لەبەردەمی شوێن کەوتووان:

لەم سەردەمەدا پانتایی زەوی موسڵمان فراوان بوو لەیەك نەتەوە زیاتر هاتە ناو ئیسلامەوە. یەك زمـان بۆ بـەکۆ زمـان، لەیـەك کـەشو هـەواو جوگرافـیو کیشوەر بوو بە فرە ئەوانـەو سـنووری وڵاتـی ئیسلام زۆر بـوو لـەرووی درێـژیو پانییـەوەو کاتو هۆکـاری هاتو چۆ زۆر کزو لاوازو سەرەتایی بوو کۆی دەنگو یەك دەنگی نەماو یاساو رای بەرامبەر هاتـە کایـەوەو بـیروبۆچوونی نــەیار بەئاســانیو زوو نەدەهاتــە ناوەندی حوکـمو فەرمانڕەوایی کە ئـەوەش هۆکاری خـۆی هەیـە وەك دووبـەرەکیو خوێنـاویو شـەڕی براکـوژی لــەنێوان موسـڵمانەکان لەسـەر جێگـری پێغەمبـەرەوەﷺ خەلافـەو لـەنێوان دوو بــەرەبابی گــەورەو بنەماڵــەی معاویــەو کوڕەکــانی، عــەلیو کوڕەکـانیو دوولـەت بوونـی رای گشـتی سـەردەمو دژایـەتی لەسـنووری بـیروڕا دەرچـوو بـۆ گۆڕەپـانی کوشـتارو رێبازەکانی شیعەو خـەواریجو پـەیڕەوانی سوننەو جەماعە کە ناوەکان بەپێی خواستی زۆرینـە کەسییە ناونرابوو دەنـا شیعە نـاوی ئـەهلی بەیتـەو خـەوارج ئـەهلی بـڕواو سوننە ئـەهلی حـەق،و هـەر کۆمەڵەیەك ئەویتری بە دەرچوو لە جوغزی ئیسلام دادەنــا، لــێرە هۆکــارێکیتر دێتــە نــاوەوە کــە بڵاوبوونەوەی زانایانە لە هەرێمـەکانو پـەیدا بوونـی شاری تری گەورەی وەك کوفە، دیمەشق، میسر، یاسای شـورا ئـەو جێبەجێکردنـەی نـەماو دەسـەڵات بووبـە میرات لە بابەوە بۆ کوڕو هەندێ جار نێوان براو بـرا ئاژاوە دەبوو.

رێبازی فیقهی بوو بە دوو تەوەری جیـاواز لایـەك خۆی بەستەوە بە دەقەوەو هیچ شێوەی خـۆی لانـەدا لە دەق کە ناویان (بنەماڵەی فەرموودەیە) لایـەکیتر لە ژێر سێبەرو تیشکی دەقدا قەیاس دەکاتو بـەپێی کاتو شـوێنیو کـەس فرمانـەکانی شـەرع دەگونجێنـن بەوانــەش دەڵێــن( بنەماڵــەی راوبۆچــوون) خــۆ گێرانـەوەی فەرموودەکە جاران خۆیـان لیدەپاراسـت نــەوەك تووشــی درۆو هەڵبەســتن بــەدەمی پێغەمبەرەوەﷺ تووش ببن بەڵام ئێستە بڵاوبـوەوەو فەرموودەش دروست کـرا بـۆ سـەلماندنی ئـەم لایـەنو ئەو لایەنو پیاهەڵدان بەم خەلیفەو ئەو خەلیفە.



بوارێکیتر ئەوە بـوو نەتـەوەکانی غـەیرە عـەرەب هاتنـە کایـەوەو هاوبەشیان کـرد لـەجالاکی فیکـریو رامیاریو زانیاری هەمـە جۆر. توانایـەکی بـەهێزترو گەشاوەتر کـە زۆری درێژەی شارسـتانی خۆیـان بـووە بـەرگـو سـیمای ئیسـلامیان کـردە بـەربیو بـەناوی ئیسلامەوە تۆماریان کردو بەفیقهی ئیسلامی ناسرا.

ئەوانەو هەندێ هۆی دەروونیو دەرەکیو پیلانـی ئایینـە بوچـەڵکراوەکانی پێشـینی وەك زەردەشـتیو فەلەو جوو کە هـەوڵیان دەدا پاش موسـڵمان بـوون هەندێ دابو نەریتو بۆچوونی خۆیان تێکەڵ بکەن لەگـەڵ بۆچوونـی ئێسـتەو کـاتی موسـڵمانیان کـە ئەوەش سوودی تێکەڵ بەزیان بوو.

## قوتـا بخانەی فیقهی شوێن کەوتووان:

لەسـەردەمی شـوێن کـەوتووان قوتابخانـە زۆر هـەبوو، بگرە هـەموو کەلـە پیـاوێکی زانـا شـاگردی خۆیـیو رێبـازی تایبـەتی هـەبوو لـەجوارچێوەی ئوصـولو قـەواعیدی ئیسلامدا، هـەندێ زۆر نزیـكو هـەندێ دوور بـەلام زۆر جیـاواز دوو قوتابخانـەی لەیـەك جـودا هـەبوو یەکـەم قوتابخانـەی شـاری مەدینەی پـیرۆز کەبنەماڵەی فـەرموودەی لێبوو زۆر جـار پێشـەوا مـالك دەیفـەرموو لـەفلان و فلانـەوە لـەخاوەنی ئـەم گـۆڕە پـیرۆزەوە دوودەم قوتابخانـەی کوفەی عێراق کە بنەماڵەی راوبۆچوونی لێبوو زیاتر زانایـانی بەبنەچـە عەجـەمو سەربەپێشـەوا عـەلی تێدابوو.

## قوتـا بخانەی مەدینەی پیرۆز:

شاری مەدینـەی پێغەمبـەرﷺ کەناوەندی یەکەم فەرمانڕەوایی ئیسلام بۆ پارێزگاری سـەرکردایەتیو پێشـەنگیو نـاوەندی ئیسلامی خـۆی کردبـوو لەگـەڵ ئـەوەش پێتـەختی نـاوەندی برپـاری لەدەسـت دابـوو وەپێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالب ناوەندی دەسـەلاتی گواستبووە کوفـەو زانـای گـەورەی یارانی نیشـتەجێ بوو وەك زەیدی کوڕی ثابت، دایکی بروادااران عائشـە، عـەبدولای کوڕی عـەباس عـەبدوڵلای کوڕی عومـەر لەگەڵ حەفت زانای بەتوانای مەدینـە وەك سـەعیدی کوڕی موسەیەب، عروەی کوڕی زوبەیر، قاسمی کوڕی محەمـــەد، ئەبوبـــەکری کـــوڕی عـــەبدورەحمان، عوبەیدیلا کوڕی عەبدوڵلا، سولەیمانی کـوڕی یەسـار، خارجەی کوڕی زەید ئەم زانایانە لەگـەڵ ئـەوەش کـە پایتـەختو نـاوەندی دەسـەلاتو قورسـایی ئـابووریو سیاسیو سەربازی لەمەدینـە نـەمابوو بـەلام لەبـەر بوونی گۆڕی پیرۆزی پێغەمەرﷺ دایکی موسڵمانانو شوێنی سێخەلیفەی گەورەو قورسو گران ئەم شـارە کێشو سەنگی خۆی مـابوو سـەدان قوتـابیو شـاگردو خێرخواز روویان لیدەکردو زانیاریان وەردەگرت.

## قوتـا بخانەی کوفە:

کوفـە شـارێکی تـازە دروسـتکراو بـوو قورسـایی هـەموو سوپای ئیسلامی لەسـەر بوو چونکە شـوێن بـەڕێکردنی سـوپاکانی ئیسـلامو زۆرینـەی یـارانی مجاهد وەك عەبدوڵلای کوڕی مەسعود. ئـەبو موسـای ئەشعەری، سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەقـاص، عـەماری کوڕی یاسـر، حوزەیفـەی کوڕی یـەمان، لەسـەرووی هەموویانـەوە ئـەوەکانی پێشـەوا عـەلی ئـەم شـارە کرابووە نـاوەندی خەلافـەتی ئیسـلامیو سـەنگەری سـەرکەوتنەکانی ئیسـلامو لەبـەر بوونـی کۆمـەڵێك زانای فیقهی ئیسلامی وەك عەلقەمەی کوڕی قەیسی نەخـەعی، شـورەیحی قـاضی، عامـیری کـوڕی شـەرحەبیل، مەسـروقی کـوڕی جـەدەع، ئیـبراهیمی نەخـەعی، سـەعیدی کوڕی جوبێر، ئـەم شارە بـووە بەمەڵبـەندی زانسـتو زانیـاریو سـیمای تایبـەتی هەبوو.

بـەلام جیاکردنــەوەی ئــەم دوو شـوێنە مانــای جیـاوازی نیـە چونکـە هـەر دوو قوتابخانـە شـوێن کـەوتووی قورئـانو فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ بـوون، هەردوو ئەگەر دەق نەبوایـە لەرێگەی(ئیجتیهاد)ەوە کاریان دەکرد بەهەندێ تایبـەتمـەندی کوفـە لـەبیرورا دەربڕینی بێ پەرواوبوون لەبەڵگەکانی شەرعی کە کـۆ دەنگە(اجماع) لاواز بـوو لەگـەڵ قیـاس چونکـە شـیعە ئینکاری قیاس دەکەنو خـەواریج بروایـان بـەئیجماع



نەمابوو لەبەر جیاوازی‌و ناکۆکی‌و ماوەی راپرسینی زۆر کەم‌و لاواز بوو.

جیاوازی لەفیقهدا وەك یاسا دیاردەیەکی دروست‌و فراوانییە، کە جیاوازی رەگەزو رەنگ‌و زمان‌و ژینگە هەبێت جیاوازی گرفت‌و کێشە هەبێت جیاوازی کردارو گفتیش هەیە، خۆ مەرج نیە هەموو جیاوازییەك هاودژ بێت یان لەیەك جودا بێت کە ئەوەش مرۆڤ پەلکێش بکات بۆ ناکۆکی‌و بەربەرەکانی‌و بەگژیەکدا چوون لەم رووانگەی زاراوەی فیقهی خیلاف پەیدا بوو لەسەر مەسەلەیەك چەند بیروبۆچوونێك پەیدا دەبێ بەلام ئەوەی بەلگەی دەوڵەمەندو بەهێزی فیقهی خیلاف کە دەفێکی زیندوو چەند بارێك هەڵدەگری، تەنها زانای شارەزا دەزانێ لەکوێدا بەکاریان دێنێ، کابرای عەوام داوای بەلگەی لێناکرێ کە ئەو کارەت چۆن ئەنجام داوەو بەلگەت چیە تەنها بزانی ئەو راوبۆچوونی پێشەوایەکی پەسندی زانایانەو لەسەرچاوەی شەریعە وەرگیراوەو ئەو زانایە لەسەرچاوەی خۆی پەسندی کردووە. کە ئەوەش یاسایەکی سرووشتییە، چونکە یاسا پێش دانانی دەیان سەرچاوەی هەیە بەلام کە کرا بەیاسا دەبێ هەموو پەیرەوی بکات وەك لەئسوولدا هەیە حوکمی قازی ناکۆکی لادەبات‌و هەموو رێگەکان دەبنەوە بەیەك. لەزانستەکانی ئیسلامی جۆرێك هەیە بەناوی(آداب البحث و المناظرة) کە فیقهی خیلاف زیاتر لەسەر بنەماکانی ئەم زانستە کێشەکانی تاوتوێ دەکرێ‌و زاراوەی(منع ونقض ومعارضة) کە بەزمانی کوردی ئەسەلماندن هەڵوەشانەوە، هاودژ، کەلەڕاستیدا زانایان زۆریان سوود لێوەرگرتووە کە بەم شێوە گفتوگۆو توێژ لە(جدل) حەرام خۆیان پاراستووە کە ئەو جۆرە هێنانەوەی بەلگەو دژەکەی بۆ گەیشتنە بەڕاستی نەوەك بۆ ئارەزوو زاڵبوون‌و قسە بەشەڕدا(وجادلهم بالتی هی احسن) ئاماژە بەم بەجۆرە جەدەلە کە بەهێمنی‌و لەسەرخۆو هەرگیز نابێتە هۆی دژایەتی‌و دووبەرەکی‌و ناکۆکی‌و نابێتە جێگەی رەخنەی ئیسلام(ولا یزالون مختلفین الا من رحم ربك ولذلك خلقهم) هود ١١٩.

## رەهەندەکانی جیاوازی:

لەسەرەتاوە ئەوەمان وتووە کە جیاوازی دەبێ بەبەلگە بێ وە لەنێوان زانایاندا بێت‌و لەسەر شتی گرنگ‌و سەر نویشت ساز بێت‌و ئاڵوگۆڕی بۆچوون بێت‌و سوود بەخش‌و بەکەڵك بێت، زانستیانە بێت لەناو کەم عەقڵ‌و کەم فام نەبێ‌و سووك‌و ساند نەبێ‌و خەڵکی ناحاڵی نەیکاتە خۆراکی خۆیی‌و نیازیش پاك‌و خاوێن بێت‌و بۆ گەیشتنی بەئامانج‌و رێگەی راست بێ‌و دەمارگیریتێدا نەبێت‌و نەکرێتە بیانووی خۆ دەرخستن‌و تەنها (خالف تعرض) ئەوە بێت لەکۆمەڵ هێمای یەکتر ناسینەوەو گروپ‌و تاقمبازی بێت قورئان دژی ئەم جۆرە جیاوازییەیە کەلەسەر ئەوەی ئەو کارە سوننەیە بدعەیە تووشی جەدەلی حەرام ببین( ولو اتبع الحق اهواءهم لفسدت السماوات والارض ومن فیهن) المؤمنون ٧١.

پەسەندە ئاماژە بکەین بەجیاوازییەکی ترسناك کە هۆی گومڕایی‌و لەڕێ لادانی هەندێك چ لەناو ئایینەکانی ئاسمانی چ لەناو رێبازەکانی یەك ئایینی ئەوەش جیاوازیەکە کە رەنگ‌و بۆن‌و تامی ئارەزووی نەفس‌و شەیتانیان تێدایە لەگەڵ دەق‌و مانا رەوانەکەی سەرچاوەی ئایینەکە ناکۆك‌و ناسازەو تەنها بیرێکی راگوزاریەو خەیاڵ‌و ئەندێشەی خۆپەرستێك بووەو کراوە بە پەیکەری پەرستنی بۆ دۆزینەوەی ئەم حاڵەش تەنها قورئان سەنگی مەحەکەو پێوەرو کێشانە تەنها لەڕێگەی قورئان‌و فەرموودەی پێغەمبەرەوەﷺ دەبێ تەنها بەکەمی بیرکردنەوەو تێرامان‌و ورد بوونەوەو گەندەڵی هەندێ رێبازو بیرو بۆچوون دەردەکەوێ کە بنەمایەکی شەرعی‌و یاسایی نیەو یەك نەفەری گومڕا دروستی کردووە.



# مانگی ڕەمەزانی پیرۆزو .. گەورەیی ڕۆژوو

**فیردەوس عەبدوڵلا**

لەگومان شۆردراوەتەوە کە خودای گەورەو بەبەزەیی و کاربەجێو جوان هەرشتێکی بەئەرك لەسەر بەندەکانی واجیب کردبێو فەرمانی پێ کردبێ جگە لەوەی نواندنی بەندایەتی بوو بێ بۆخودای گەورە، تریش ئەرك بووە بۆ ئەوەی خۆ پارێزبن، ئەوەتا خودای گەورە لەقورئانا دەفەرمووێ ﴿ یاءیها الذین امنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون ﴾ بقرة ١٨٣. دیارە ئەمەش ئەرك بوونێکی گشتییە لەسەر موسڵمانان بەنێرومێیەوە.

هەرو هەر قازانجو خێرو بێرێکی بێ ژماریشی بۆ خودی بەندەکان تێداهەبووە، هەریەکێکی پایەکانی ئایینی ئیسلام بگریت لە(شەهادەی: أن لا الە الا الله وان محمد رسول الله، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) ئەوا بۆت بەدیار دەکەوێ کەچەندانو چەندان حیکمەت وخێرو بەرەکەتی تێدا هەیە بۆ هەریەکی تاکی بەندەکانی خودا، دیارە لەپلە بەرزەکانی بەندایەتیش گەیشتنە بەخۆشویستنی خواو لێ ترسانی، لەخۆشەویستیا هەر چی فەرمانو پێ خۆشبوونی خودایە ئەکردار دەرژێ بەسەرتاو جێبەجێیان دەکەیت، لەترسانیشا هەرچی نەهیو پێ ناخۆشبوونی خودایە لەسەر ئەنجامدانی کردار لێی دووردەکەویتەوە، چونکە خودای گەورە جنۆکە کەو مرۆڤی بۆ هیچ شتێك دروست نەکردووە، مەگەر بەتەنها بەندایەتی کردنی خودای گەورە، ئاشکراشە بەندایەتی کردنی ئێمەش بۆ خودا ناجەسپێ تا دوو خاڵ لەسەر خۆمان جێبەجێ نەکەین، یەکێکیان هەرچییەکی کردارو سەر لەبەری ئیشەکانمان بەتەنها بۆ خودای گەورە بێت بەدڵسۆزی.. ئەوەی تریشیان لە سەر ڕێو شوێنی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ ئەنجام بدرێ.

خودای گەورە بەهەزاران ڕێو هۆکاری بۆ بەندەکانی دەست نیشان کردووە تابەهۆیەوە لەخودای خۆی نزیك ببێتەوە وبترسێتو خۆ پارێزی بکات لەوانەی کەخودای گەورە پێی ناخۆشە، یەکێکی ئەوانەش ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزە، کەیەکێکە لەپایەسەرەکییەکانی ئایینی ئیسلامیش. ئەورۆژووەی کەلەسەر گەلو میللەتانی

**یەکەم: واجیب بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:**

بەبەڵگەی قورئانی خودای گەورەو میهرەبان لەقورئانی بەرزو پتەو بەرێزا ئاماژە بۆئەرك بوونی ڕۆژووەدەکات لەمانگی ڕەمەزانا لەسەر موسڵمانان تاشوکرانە بژێری بۆ بکەن لەسەر هیدایەت دانیان، خوای گەورە لەسورەتی بەقەرە ئایەتی (١٨٥) دەفەرمووێ ﴿ **شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان فمن شهد منكم الشهر فليصمه ومن كان مريضا أو على سفر فعدة من أيام أخر يريد الله بكم اليسر ولايريد بكم العسر ولتكملوا العدة ولتكبروا الله على ماهداكم ولعلكم تشكرون** ﴾.

واتە ئەو مانگی ڕەمەزانەی کە قورئانی بۆ ڕێنوێنی خەڵكو بەڵگەی بۆ ڕێنوێنی وجیاکردنەوەی هەق لەناهەق دابەزاندووە، جا هەر کەسێك ئەومانگەی بەسەردا هات بابەڕۆژووبێ، وەئەگەر یەکێکتان نەخۆش بوونیان لەسەفەر بووبا دواتر ڕۆژوو بگرێ لەڕۆژانی دوای ڕەمەزاندا، چونکە خودای گەورە ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێ لەبەندایەتیەکانو گرتنکاری لەئێوە گەرەك نیە، بۆیە دەبێ هەر (سێ ڕۆژ)ەکەی مانگی ڕەمەزان بگرنو خوداش بەگەورەو بەبەدەسەڵات بزانن لەسەر ئەوەی ڕێنوێنی بۆ کردوون، شوکرانە بژێریش بن، دیارە ڕۆژووی ئێمەی موسڵمانی گەلی پێغەمبەر (محمد) ﷺ زۆر زۆر ئاسانترە لەئوممەتانی تر چونکە هیچ نەبێ ئەوان دەبوا قسەش نەکەنو لەزمانیشا بەڕۆژوو بن. ئەوەتا خودای گەورە دەربارەی (مریم) لەقورئانا



دەفەرمووێ ﴿ فإما ترين من البشر أحداً فقولي إني نذرت للرحمن صوماً فلن أكلم اليوم إنسيا ﴾ (مريم ٢٦) واتە ئەگەر یەکێکت بینیو هاتنە لات بۆ پرسیارو قسە کردن بەنیشارەت پێیان بڵێ کە من بۆ خودای میهرەبان ڕۆژووم لەسەرە خۆم نەزر کردووەو ئەمڕۆ لەگەڵ کەس قسەناکەم.

**دووەم: شەوی قەدری ناو رەمەزان**

دیارە کەهەر خودی بەرۆژوو بوون زیاد لەپێویست پاداشتی هەیە لە لای خودا بۆ یە خودای گەورە لەحەدیسێکی قودسیا کەپێغەمبەر ﷺ دەرکاندوویەتیو موسلیمو بوخاری گێراویانەتەوە دەرفەرمووێ (الصوم لي وانا اجزي به) واتە بەرۆژووبوون بۆ منەو (واتە بێ ریا) هەر بەخۆشم پاداشتی دەدەمەوە، کەئەمەش هێمای زۆرو زۆروەندی پاداشتەکەیە، لەگەڵ ئەوەش لەومانگەدا شەوێکی تیایە هەر مەپرسە شەوێکی چەند بەبەرەکەتو خێرو بێرەکە ئەو شەوەش شەوی قەدرەو پێغەمبەر (علیه السلام) زۆر گرنگی پێداوە چونکە خودای گەورە لەسورەتی (القدر) لەقورئانا دەفەرمووێ ﴿ انا انزلناه في ليلة القدر وما ادراك ماليلة القدر* ليلة القدر خير من ألف شهر* تنزل الملائكة والروح فيها باذن ربهم من كل أمر* سلام هي حتى مطلع الفجر ﴾ واتە ئێمە ئەو قورئانەمان لەشەوی لەیلەتول قەدەر دابەزاندووە، جا تۆ ئەی (محمد) نازانی کەشەوی قەدر چیە، شەوی قەدر باشترەو خێری پترە لەهەزار مانگی بەندایەتی کردنی ڕۆژەکانی تر، هەر لەوشەوەدا فریشتەکانی خودا دادەبەزن بۆ هەموو کارێك بە فەرمانی خودا، ئەوشەوەش تابەرەبەیان پڕە لەئاشتیو درورد،،، ئیدی دیارە کەخودای گەورە رەحمێکی چەند گەورەی بەئێمە کردووە کەبەندایەتی کردنی یەك شەوی ئاوها پتر لە (٨٣) ساڵ خێری هەیە، دیارە ئەمەش هەر لەخودای رەحمان دەوەشێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئاماژەی بۆ کردووین کەلەڕۆژە تاکەکانی دوایی مانگی رەمەزانا بۆی بگەڕێین واتە (٢٩،٢٧،٢٥،٢٣،٢١)ـ چاکترین دوعاش لەوشەوەدا بکرێ ئەوەیەکە عائیشە (رضی الله عنها) پرسیاری کرد لەپێغەمبەر (علیه السلام) ئەویش فەرمووی بلێ: (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عنا) (واتە ئەی خودای گەورە تۆ خۆت لێبوردەی، وەلێبوردنیشت خۆش دەوێ، بۆیە لێت دەپاڕێینەوە بمان بووری...) یەکێك لەنیشانەکانی ئەوشەوەش ئەوەیە بەیانیەکەی کەرۆژ هەڵدێ تیشکی نیە هەتا بەرزدەبێتەوە، بەبەڵگەی ئەوەی لەموسلیم گێردراوەتەوە کەپێغەمبەر (علیە السلام) فەرموویەتی (صبحة ليلة القدر تطلع الشمس لاشعاع له، كانها طست حتى ترتفع).

**سێیەم: هەندێ لەوشتانەی پێغەمبەری خودا ﷺ کردوونی :**

١- گەلەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە کەرۆژێك یان دوو رۆژ بەر لەهاتنی ئەو مانگە بەرۆژوو نەبن بەبیانووی خۆ ئامادەکردن.

٢- لەشەوا نیەتی دڵی دەهێناو بەیانیەکەی بەرۆژوو دەبوو، بەم شێوەش فەرمانی بەگەلی خۆی کردووە، بەڵام لەرۆژووە سونەتەکانی بەر لەرەمەزانو دوای رەمەزان جاروابووە بەیانی چۆتە لای خێزانەکانی وپرسیاری نانی لێکردوون ئەوانیش وتوویانە شتێکی ئەو تۆمان نیە، ئەمیش بێ نیەت هێنانی شەو یەکسەر گوتوویەتی مادام ئەمڕۆ بەرۆژوو دەبم.

٣- لەپارشێو بەردەوام دەبوو لەخواردنو خواردنەوە تابەرەبەیانی راستو روون (الفجر الصادق) بەبەڵگەی قورئانی پیرۆز ﴿وكلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر ﴾ (البقرة ١٨٧) واتە بخۆنو بخۆنەوە هەتاوەکو هێڵو داوی رەشو سپیتان بۆجودا دەکرێتەوە بەتیشکی بەیان.

٤- پەلەی دەکرد لەئیفتار کردنەوەو دەیفەرموو (لاتزال أمتي بخير ماعجلوا الفطور).

٥- لەو مانگەدا پتر خەریکی خواپەرستی بوو لەچاو مانگەکانی تر.

٦- لەو مانگەدا قورئانی جارێك تەواو دەکرد، تەنها ساڵی کۆچکردنی نەبێ لەگەڵ جوبرائیلدا (علیه السلام) دووجار قورئانیان خەتم کرد)

٧- لەشەوا هەڵدەستاوەو نوێژی تێدا دەکرد، دەیفەرموو (من قام رمضانا ايمانا واحتسابا غفر له ماتقدم من ذنبه) (بوخاری) واتە ئەوەی شەوەکانی



رەمەزان هەڵبستێتەوە بۆ بەندایەتی کردن، باوەڕی بەدڵ پێی هەبێ ئەوا خودای گەورە لە هەمدو گوناهەکانی پێشووی دەبورێ..

٨- ڕۆژوو گرتنیش بریتیە لە خۆپارێزکردن لە دەمو دەستو قاچو چاوو هەموو ئەندامەکانی لەشمان، کە پێغەمبەری خوداش ﷺ رابەرو پێشەوامان بووە لەم بوارانەو لە هەموو بوارەکانیتری بەندایەتی کردنیشدا.

٩- پارشێوی دەخواردو هەڵدەستاوە بۆ نان، بۆیە دەیفەرموو: لە موسلیمەوە (فصل ما بین صیامنا وصیام أهل الکتاب السحر) واتە جیاوازی نێوان ڕۆژووی ئێمەو ڕۆژووی خاوەن پەرتووکەکان پار شێو خواردنە..

**چوارەم: ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە :**

١- خواردنو خواردنەوە بە ئەنقەست.

٢- خۆرشاندنەوە بە ئەنقەست.

٣- بێ نوێژی ئافرەتو منداڵ بوون (الحیض والنفاس).

٤- جووت بوونو سەرجێی کردن لەگەڵ خێزاندا.

٥- لە خۆدانی دەرزییەك شوێنی هێزی خواردن بگێڕێتەوە وەك بە دیل.

**تێبینی/ (ئەرکەکانی برۆادار لە رەمەزاندا... باوکی عەبدوڵلا سابیر). سوودێکی چاكو زۆر لەم کتێبە وەرگیراوە.**

# موسڵمانی ڕۆژووگر دەبێ چۆن بێ؟

**شکاك فاتیح مەغدید بەرزنجی**

موسڵمانانی خۆشەویست

سڵاوی خواو پێغەمبەری مەزنتان لێ بێت:

خودای گەورەو میهرەبان ڕۆژوو گرتنی بەیەکێك لەروکنەکانی ئیسلام داناوە بۆ سەرجەم موسڵمانان، بۆیە پێویستە هەرچی موسڵمان لەسەر رووی ئەم زەمینە هەیە پابەندی روکنەکانی ئیسلامو لەژێر ئامۆژگارییەکانی خوداو پێغەمبەر ﷺ دەرنەچێت چونکە موسڵمانی پاكو بێگەرد ئەو کەسەیە کەدەبێ بەهەموو توانایەوە سافو بێگەردوو موسڵمانی راستەقینە بێت جگە لەوەش پێویستە هەردەم لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا دابێت، بەتایبەتی ئەو کەسەی کەبەرۆژوو بێت، ڕۆژووگر، ئەو کەسەیە کەبەهەموو شێوەیەك بەمانای وشە بەرۆژوو بێت جیالەوەش نەك بەوە بەرۆژووبێ تەنها بۆ خۆ دەرهێنان بێ بەڵکو دەبێ ڕۆڵی گرنگ لەئیسلامیەتی بگێڕێ، نابێ مرۆڤی ڕۆژوو گر زمانی خۆی بەرەڵلا بکات یاخود گوێ لەقسەی خەڵك بگرێت. یاخود قسەی ئەمو ئەو ببات‌و بێنێ ئەوانە هەر هەموو کاردەکاتە سەر سووککردنی ڕۆژوو گرتنەکە، جگە لەوەش پێویستە موسڵمانی ڕۆژووگر نوێژەکانی لەکیس نەچێتو لەکاتی ڕۆژوو شکاندندا پێویستە بۆ یەکەمین جار ڕۆژووکە بشکێنی ئینجا دەست بکات بەنوێژ کردن بۆیە ئاوا دەبێ تاوەکو ڕۆژووەکەی خێری پتر بێت، ئەگەر هاتوو مرۆڤی ڕۆژووگر بتوانێ خۆی بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز خەریك بکات ئەوا پلەی ڕۆژوو گرتنەکەی لەلای خودا زیاتر دەبێت. یاخود ئەگەر هاتوو خێرو خێراتو زەکاتی بە مرۆڤی هەژارو لێقەوماو بدات ئەوا ئەوەشی بەم شێوەیە خێری پتر دەکات پێویستە موسڵمان زۆر ئاگاداری خۆیان بن لەکاتی ڕۆژوو گرتنەکەی خۆیانو دەستو دڵ پاك بنو هەردەم دۆعای خێر بۆ موسڵمانانی دیکە بکەنو لەئامۆژگاریو تەقوای خودا دوور نەکەونەوەو یارمەتی هەژاران بدەن لەم مانگە پیرۆزو بەرەکەتەدا ڕۆژوو گرتن جگە لەوانە سوودێکی تایبەتی بەلەشی ئادەمیزاد دەبەخشێ بۆیە پێویستە هەموومان بەڕۆژووبین ئیتر خودا ڕۆژووی هەموو موسڵمانان قەبووڵ بکات.

# حەزرەتی محەمەد ﷺ لەئنجیل و تەوراتدا

## شادمان

لەئنجیل وتەوراتدا زۆر بەئاشکرایی باسی پێغەمبەری خۆشەویستمان (محەمەد) ﷺ کراوە، پێش ئەوەی کە (محەمەد) ﷺ ببێ بەپێغەمبەر دیانەکان چاوەڕێی بوونو مێژوو پڕە لە قسەو باسەکانی راهبو قەشەی گەورە وەکو بوحەیراو.. باسی ئەم پێغەمبەرەیان دەکرد، لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا ئێمە چەند باسێکتان دەخەینە پێش چاوو هەر کەسێکیش ئەگەر بیەوێ دڵنیابێت لەم شتەبا بڕوانێتە:

(سفرا تثنیه) فەصلی ۱۸ ئایەتی (۸) فەصلی ۳۳ ئایەتی (۲) کتێبی ئەشعیا فەصلی ۲۱ ئایەتی ۱۳-۱۵، کە لەمەدا خاکی عەرەبستانو هیجرەت بەتەواوی روونکراوەتەوە، ئنجیلی یوحەننا بابی ۱۴ ئایەتی ۲۶،۲۵، بابی ۱٦ ئایەتی ۷،۸،۱۲،۱۳، ولەجێگاکانی تریش ئەمەش نموونەیەکە:

(ئەگەر منتان خۆش دەوێتو دەتانەوێ ئەو رێیەی من جێبەجێ بکەن ئەوا من لەخودا دەخوازم کەرزگار کەرێك بۆ ئێوە بنێرێت کەهەتا هەتایێ لەگەڵتان بێت، ئنجیلی یوحەننا باب ۱٤ ئایەتی ۱٥،۱٦).

### فارقلیط و پر گلوطوش کێن؟

﴿ **وذا قال عیسی بن مریم یابني اسرائیل اني رسول الله الیکم مصدقا لما بین یدي من التورات ومبشرا برسول یأتي من بعدی اسمه احمد فلما جاء هم بالبینات قالوا هذا سحر مبین** ﴾ سورەتی الصف ئایەتی ٦

واتە: کاتێ کەعیسا کوڕی مەریەم بەبەنی ئیسرائیلیەکانی گووت: من نێردراوی خوامە بۆ ئێوەو تەورات قەبوڵ دەکەمو بەڕاستی دەزانم ومژدەدەری پێغەمبەرێکم کەلەپاش من دێتو ناوی ئەحمەدە، پاش ئەوەش کەبەلگەی بۆ هێنان گووتیان : ئەوە سیحرە...

ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئان بەڕاشکاوی دەڵێت کەعیسا ﷺ لەهاتنی (محەمەد) ﷺ خەبەری داوە، ئایەتی تریش هەیە کەئەم باسە ئاشکرا دەکەن وەك ئایەتی ۱۵۷ سورەتی الاعراف کە دەفەرموێت ﴿ **الذین یتبعون الرسول النبي الامي الذي یجدونه مکتوبا عندهم في التورات والانجیل** ﴾ پێویستە ئەوەش بڵێین ئەگەر لەتەوراتو ئنجیل باسی پێغەمبەرﷺ باسی هاتنی نەکرابا ئەوا ئەو کاتەی کەئەم ئایەتانە دەهاتنە خواریێ دیانو جووەکان کەهیچ وەڵامو رەددانەوەیەکیان نەبوو سوورتر دەبوونو لەسەر دوژمنایەتی پێغەمبەروﷺ دەیان کردە موشکیلەو شتەکەیان زۆر گەورەتر دەکرد کە هەر چەندبێ هودەش بوو.

### موسڵمان بوونی زانایەکی مەسیحی:

(محەمەد صادق فخر الاسلام) کەیەکێك بوو لەزانایەکانی مەسیحیەکان پاش ئەوەی کەموسڵمان بوو و زۆر کیتابی نووسی، لەکیتابی خۆی (انیس الاعلام) هۆی موسڵمان بوونی خۆی وەها دیار دەکات و دەڵێت:

لەتەمەنی دوانزدە ساڵیم کەوتە دڵم کە من بیرو باوەڕی هەموو بەشەکانی مەسیحی بزانم ومن لەسەر ئەم بڕیارە بووم تاکو زانایێکی گەورە (قەشە) کە لەناو قەومەکەی خۆی مەشهور بوو بەتەقواو زانین دۆزیمەوەو چوومە لای بۆ دەرس خوێندن، هەموو رۆژێ نزیکەی ٤۰۰ تا ٥۰۰ کەس دەهاتن بۆ دەرس خوێندن، بەخۆشی لەناو ئەم هەموویانە زۆر منی خۆش دەویستو بێجگە لەکلیلی ژووری گچکە کە کلیلی دەرگاکانی تریش تەسلیم بەمنی کردبوون،



ڕۆژێك گرفتێكی تووش ببوو بەمنی گووت ئەی گەنج برو خوێندكارەكان بڵێ كە ئیمرۆ دەرس ناخوێنین، منیش كەچووم بەخوێندكارەكان بڵێم گوێم دایێ كەخوێندكارەكان لەسەر دوو وشە موناقەشە دەكەن. وشەكانیش (فارقلیط) لەزمانی سوریانیداو (پرگلوطوس) لەزمانی یونانیدا كە یوحەننا خاوەنی ئنجیلی چوار باسی هاتنی كردووە لەبابی ١٤، ١٥،١٦ كە لەعیساوە نەقلی كردووە كە گووتیتی پاش من فارقلیط دێت.

ئەم گفتوگۆیەی خوێندكارەكان درێژەی كێشاو هەریەكێك ڕاوبۆچوونێكی خۆی هەبوو كەجودابوو لەهی ئەوی تر، پاش كەئەوان واتە خوێندكارەكان چوون محەمەد صادق دەڵێت: ئەمن چووم بۆ لای مامۆستا كەمو ئەویش بەمنی گووت ئەی گەنج ئەوە گفتوگۆی خوێندكاران لەسەر چ بوو؟ منیش هەمووم بۆ باس كرد.

ئەویش وتی: ئەوەی ئەوان دەڵێن هیچی وانیەو حەقیقەت شتێكی ترە. منیش پێم گوت ئەی مامۆستای بەڕێزم تۆ باش دەزانی كە من چۆن خۆم ماندوو دەكەم بۆئەوەی كە لە مەسیحیەت شارەزا ببم جا خۆم تەسلیم بەو یزدانو زەمیرت دەكەمو دەستت ماچ دەكەم كەمانای ئەم وشەیە بۆم بڵێی.

محەمەد صادق دەڵێت: ئوستادەكەم زۆر گریاو گووتی ئەوەی ڕاستی بێت تۆ زۆر خۆشەویستی لەلای من بەڵام ئەگەر من مانای ئەم وشانە بۆت بڵێمو دوایێش ئاشكرا ببێت ئەوا منو تۆو كەسو كاریشمان هەموویان بەدەستی مەسیحیەكان دەكوژرێین، بەڵام ئەگەر تۆ وەعدم بدەیتێ كەهەتامن مابم ناوم بەهیچ شێوەیەك نەهێنی ئەوا من حەقیقەتەكەت پێ دەڵێم محمد صادق لەكیتابەكەی (انیس الاعلام) دەڵێت:

منیش عەهدو پەیمانم پێدا كەبەهیچ شێوەیەك ناوی نەهێنمو ئاشكرانەكەم. ئینجا ئوستادەكەم گوتی: ئەم ناوە ناوی پێغەمبەری موسڵمانانە كەمانای (محەمەد، ئەحمەد)ە، پاشان كلیلی ژووری گچكە كەی دامیو گووتی برۆ فلانە سندوق بكەرەوەو فلانە كتێبو فلانە كتێبم بۆ بێنە. منیش چووم هەردوو كتێبم بۆهێناو ئەویش كتێبەكانی كردەوەو پێی پیشان دامو دیتم كەباسی هاتنی پێغەمبەر ﷺ دەكەنو بەخەتی سوریانیو یونانی نوسرابوو لەبەرامبەرەكەشیدا تەرجوومە كرا بوو فارقلیط واتە (محەمەد و ئەحمەد)، پاشان ئوستادەكەم گووتی: پێش ئەوەی كە (محەمەد) ﷺ ببێ بەپێغەمبەر هەموو زاناو قەشەكانی مەسیحیەكان یەك ڕابوون لەسەر ئەوەی كەئەم وشەیە بەمانای (محمد و ئەحمەد) دێت، بەڵام پاش هاتنی محەمەد ﷺ قەشەو زاناكانی مەسیحیەكان لەبەر حەسوودیو بوغزو مەسلەحەتی شەخصی خۆیان مانای وشەكانیان گۆڕیو مانایەكی تریان بۆدانا كە حەقیقەت قەسدی صاحبی ئنجیل ئەونیە، وەكە ئەوان دەڵێن مانای فارقلیط واتە (روح القدس) كەجبرائیلە(س) وانیە.

محەمەد صادق دەڵێت: ئوستادەكەم گوتی: چونكە عیسا (س) گووتیتی (هەتا ئەمن نەڕۆم فارقلیط نایەت) واتە چۆن خۆی كردۆتەوە شەرتو مەرج بۆ هاتنی فارقلیط، وە (روح القدس)یش پێش خۆیو بۆ خۆیشی هاتوودو هاتنی (روح القدس) یش گرێدراو نیە بەچوونی عیسا (س) كەواتە بێ شەرتو مەرج مانای فارقلیط (محەمەدو ئەحمەدە)و هیچی تر.

محەمەد صادق دەڵێت پاشان گووتم ئوستاد ڕات چیە بەرامبەر بەدینی مەسیحیەت؟ ئوستاد گووتی: پاش هاتنی محەمەدو هاتنە خوارەوەی قورئان دینی مەسیحیەت نەسخ بووەو كاری پێ ناكرێت وسێ جار ئم قسەیەی دووبارە كردەوە.

---

سەرچاوە: (ژیانو وەفات) نووسینی : سەید حوسەینی بوهتی، سەید عەلی ئیرسی.



# دەبێت (محەممەدی مەهدی) کێ بێت!؟

**تـەبا بـەرزنجی**

لـەم ڕۆژگـــارە پــڕ ســەرودەریەی ئـەمڕۆی ئێمـەی بەختـەوەر تیـایدا دەژیـــن لـــەناو کونجـــی هـــەموو گۆشـەیەکی زانســتو سـەلماندنەوە لەگۆشەنیگای هەموو ڕووحانیـەتێکی پاکەوە کەوا لەسـایەی خوای گـەورەو پێغەمبەری مەزنمانﷺ خەڵك بەبێ بەلگـە گیانیـان پێـش جەســـتە ئەنگوستی شـەهادەت بۆ ئیسلامەتی درێــژ دەکــاتو چاویـــان لەوەیـــە چاوەکانیـان بەوشـەی پــڕ ســوود کـەڵکدار بکـەن حـەز دەکـەم جێـی سەرنج بێ چەند پرسیارێکیش خۆی حەشارداوەو بۆتە خولیای موسوڵمانانی ئەم سەردەمە ئـەویش ناسـینی محەمـەدی مەهدییـە هـــەروەها نهێنیەکیش خۆی مەڵاس داوە ئەویش ئەوەیە کە ئایا کەیو لەکوێ دێتە دنیاوە کێیـە؟ هەڵبـەتـە لەهـەموو بوارێکدا دوژمنانی موسڵمانان دەسـتکاری ڕووداوەکان دەکەن لەرۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ئەوەی دەسەڵاتیان تێدا هەبێ بـەگوێرەی خۆ سـەپاندنیانو بـەنمرەی دەست نیشـانکردنی موســـڵمانانی بـــەغیرەت هـــەروەکو پێغەمبـــەری مـــەزنو خۆشەویسـتمان محەمـــەدﷺ دەفەرمووێ(یوشك الامم ان تداعي عليكم كما تداعي الاكلة على قصعتها، فقال قائل، ومن قلة نحن يومئذ يارسول الله، قال بل انتم يومئذ كثير ولكنكم غثاء كغثاء اليل) واتـە بۆیـە هـەموو نیشتمانی موسڵمانان پارچـە پارچـە کراوەبـەچاندنی تـۆوی ڕقو کینــەو جیـاوازیکردن لـەنێوان گـەلاندا، جا ئێمـەش دەزانـین ئەوەی لەسەر خاکە خاکە هەروەك پێشـیان وتوویانە جالەم ڕوانگەیەوە هـەموو زیندەوەرێـك حـۆن بـووەو دەبێ بمرێت بـەم ڕەنگـە گـەورەیو سـرِی خواناسـین لەمرندندا بەرزترین جڵی خودا ناسینە: دەنەمجا تۆی موسڵمانی ژێر قۆڵت هەڵماڵـەو بـیرت ڕۆشـن بکـەرەوە بـەهاتنی حـەزرەتی ئـادەم سـەلامی خـوای لێبێو سەرەتای ژیان نیشـانەیەتی هـەروەها کەژیان دەستی پێکرد ئـەبێ بـەردەو کۆتـاییش بـڕوا بەهاتنە خواردووەی حـەزرەتی عیسا سـەلامی خـوای لێبـێ کـە دەبێتـــە پاڵپشتی ئیمام محەمـــەدی مـــەهدی لەگەڵ نـوری خـوا بەخەبـەر بێــتو ئێمەش وەکو سەرە رمێکی شۆڕشو ڕاپـــەڕینی بـــیرو ئەندێشـــــەی حەقیقـەت.. بەرێگەیـەکی زانسـتی ڕمین هەروەکو باوکی کـورد بـارزانی نـەمر فەرموویەتی( قوتـابی سـەری ڕمە لەهەموو شۆڕشو ڕاپەڕینێکدا) جێگەی پەنجەی خۆمـان بکەینـەوە ئەگەرچی دڵۆپێك لەدەریای زانسـتی ناسینیش بێ پشتیوانی خواوەندی مەزنمان.

**١- نـــاوی :**

محەمەد کوڕی عەبدوڵلایە هەروەك لەفەرموودەی پێغەمبەرداﷺ هاتووە(لو لم يبق من الدنيا الا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يبعث رجلا منى او من اهل بيتى يواطـىء اسمه اسمي‌واسم ابيه اسم ابى يملىء الارض قسطا وعدلا كما ملئت ظلما وجورا)

**٢- نازناوی: مەهدی، الجابر**

بۆیـە بـەم نـاوە نـراوە یەکـەمیان: چونکـە خـوای گەورە هیدایەتی ڕێگـای ڕاستی پێدەدات، دووەمیـان: چونکە ڕێگـا بـەکارێکی بزربـوو دەکـات لەچیایـەك لەچیاکانی شام لەم شوێنەدا اسخارو تەوراتو ئینجیل بـەدیار دەخـات، وەپێـی دەڵێـن(الجـابر): چونکـە دەسەڵات دەخاتە ناو دڵی ئوممەتی پێغەمبـەرﷺبۆ لەناو بردنی دوژمندارانی ئیسلام.

وە یەکێکە لەنـەوەی پێغەمبـەرﷺ بەڕەچەڵـەك دەچێتـە سـەر حەسـەنی کوڕی ئـەبو تـالیب هـەروەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە(المهدى من عشيرتي من ولد فاطمة) وێنـەش بـۆ ئـەم فەرموودەیە وتـەی ئیمـامی عەلییـە ڕەزای خـوای لێبێـت کـاتێك تەماشـای جگـەر گۆشەکەی کردووە ئەویش حەسەنی ناو بوو وتـی( ان



ابنى هذا سيد كما سماه النبى(ص) وسيخرج من صلبه رجل يسمى باسم نبيكم يشبهه في الخلق ولايشبهه في الخلق)

**٣- نیشانەکانی رەوشتو وێنەیی:-**

ا پەرچـەمێکی کـەمو لـوت بـەرزە هـەروەك لەفەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ هاتووە: ا المهدى اجلى الجبهة اقنى الانف)

ب- شێوەی دەڵێی مانگی چواردەیە وێنـەش بـۆ ئـەم قسـەیە فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووێت: ( المهدى رجل من ولدي وجهه كالكوكب الدري).

ج- خاڵێکی رەشی لەسەر رووەمەتی لای راستی هەیە وەك لەم فەرموودەیـەدا بـاس کـراوە(کان وجهه کوکب دري في خده الايمن خال اسود عليه عباءتان قطوانيتان)

د- ریشێکی پـڕو رێكو چـاو رەشـێکی بریقـەدارو روویەکی جوانو گەشی هەیە ددانـەکانی وەك تریسکە دەدرەوشـێتەوە لەبـەر سـپیەتی رەنگـی. هـەروەك پێغەمبـەرﷺ دەفەرمووێت(كث اللحية اكحل العينـين براق الثنايا في وجهه خال).

هـ- برۆکـانی کەوانـەیین لەگـەڵ درێژیـان بەیـەکتر نانووسێن وەك لـەم فەرموودەیـەدا باسکراوە: ( المـهدي رجل ازج، ابلج، اعين)

**٤- شوێنی لەدایك بوونی:-**

شوێنی لـەدایکبوونی لەشاری مەدینـە دەبێـت وەك لـەم فەرموودەیـەدا هـاتووە: (( المهدي رجل ازج، ابلـج، اعين يجيء من الحجاز حتى يستوى على منبر دمشق، وهو ابن ثماني عشرة سنة).

هـەروەك قرطبـی باسـی لێـوە دەکـات دەڵێـت لەرۆژئاوای مەدینـە واتـە شـاری شـام لـەدایك دەبێـت وێنەش بۆ ئەو قسەیە هەروەك سەعدی کوڕی وەقاس یەکێك لەفەرموودەکان دەگێرێتـەوە(لايـزال اهـل الغـرب ظاهرين على الحق حتى تقوم الساعة)

**٥- کارەکانی:**

١- یـەکبوونی هـەموو میللـەتو نەتەوەیـەکی ئیسـلام لەژێر ئاڵای ئیسلام.

٢- بڵاوکردنـەوەی یەکسانیـەتیو دادپـەروەری لـەنێوان گەلانی جیهانـدا.

٣- رزگارکردنی موسڵمانان لەژێر چەوساندنەوەدا.

٤- چـەند جـەنگێك ئـەنجام دەدات بـۆ گرتنـەوەی جەزیرەی عەرەب(تغزون جزيرة العرب فيفتحه الله ثم فـارس فيفتحها الله ثـم تغـزون الـروم فيفتحـه الله ثـم تغزون الدجال فيفتحه الله) بەم شێوە موسڵمان لـەژێر دەسەڵاتی عەرەبو فارسو رۆمو دەجال رزگار دەکرێن.

(لاتذهـب الدنيـا حتـى يملـك العـرب رجـل مـن اهـل بيتى يواطىء اسمه اسمى).

ئینجا لـەکۆتاییدا حـەزرەتی عیسا سـەلامی خـوای لێبێ پاڵپشتی دەکـات بـەم شێوەیە ئـاڵای ئیسلام بـەرز دەکرێتـەوە لەجیـهاندا کـاری پێدەکرێـت تـاکو حـەوت ساڵ. وێنـەش بـۆ ئـەم قسـەیە هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت لـەقورئانی پـیرۆزدا(يكلـم النـاس في المـهد وكهلا) واتە حەزرەتی عیسا کەتەمەنی گەیشتە ٣٣ ساڵ دەگەرێتـەوە سـەرزەوی قسـە لەگـەڵ خـەڵك دەکـاتو بانگەوازیان دەکات بـۆ هاتنیـان بـەرەو ئـایینی ئیسـلام هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ( فعند ذلك ينزل اخي عيسى ابن مريم وينزل عيسى عليه السلام في صف المسلمين المجـاهدين الذيـن يجـاهدون الدجـال واليـهود ويقاتلونهم: فيقتل الدجال ويدخل الناس جميعا في دين الله ولايبقى على وجه الارض احد الا دخل الاسلام).

**سەرچاوەکان**


١ قورئانی پیرۆز

٢ ثلاثـة ينتظرهـم العـالم المـهدى المنتظـر. المسيح الدجـال. المسيح عيسى عليه السلام. دانانی(حمزة الفقير).

٣-توحيد الخالق. دانانی عبدالمجيد الزنداني.

٤. كتاب البرهان في علامـات مـهدى اخـر الزمـان.. دانـانی شێخ عەلی کوری حسام ناسراو المتقى الهندى.

٥. عمر امة الاسلام وقرب ظهور المهدى عليـه السلام.. دانـانی امين محمـد جمـال الديـن. دراسات عليـا في الدعـوة والثقافـة الاسلامية كلية الدعوة الاسلامية جامعة الازهر مكتبة المجلد العربى.



# سیستەمی پەروەردەو فێرکردن لەئیسلامدا

نەوزاد عەزیز عومەر

بەشی دووەم

## دامو دەزگاکانی خوێندن لەئیسلامدا:

ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ موژدەی وەحی لەلایەن خوای گەورە پێدرا، پاش ئەم موژدەیە هەڵسا بەکاری سەرشانی خۆی‌و بانگەوازی ئایینی ئیسلامی لەناو دۆستو برا دەرەکانی راگەیاند ﴿ وانذر عشيرتك الاقربين ﴾ الشعراء ٢١٤.

یاوەری پێغەمبەر زۆر پەرۆش بوون بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی ئەم ئاینە پیرۆزو تازەیە، بۆیە هەرکاتێك وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ بهاتایە زۆر بەپەلە وەحیەکەی بۆ یاوەرانی باس دەکرد، بۆ ئەم مەبەستەش بریاریدا، شوێنێکی گونجاوو لەبار بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە جێگای کۆبوونەوەی خۆیان.

بۆیە لەراستی دوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین خانووەکەی (ارقم کوری ارقم) ﷺ بە یەکەمین دەزگای رۆشنبیری‌و فکری ئیسلامی لەقەڵەم دەدرێ، کەبەشێوەیەکی نهێنی ئەم دەزگایە رۆشنبیریە هەڵدەستا بەبلاو کردنەوەی زانستی ئایینی، کەپێغەمبەر ﷺ سەرپەرشتی دەکردو هەر خۆشی رۆڵی مامۆستای یەکەمی تیا بینی.

پاش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ شاری مەدینە پێویستە ئەوە بەبیرخۆمان بهێنینەوە کە دەزگایەکی تر هەبووە بەناوی (دار القرآن). کەهەندێك لەخەڵکانی شاری مەدینە سەر بەو دەزگایە بوینەو هاموشۆی (دار القران)یان دەکرد بەمەبەستی فێربوونی‌و قورئان‌و خوێندنی ئایینی (دیبس)ی رۆژهەلات ناس دەڵێ (هەر لەبەرە بەیانی سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام شوێنی تایبەتی هەبوو بۆ کۆبوونەوەی موسڵمانەکان بۆ فێربوونی قورئان‌و خوێندنی ئایینی‌و ئەم شوێنە تایبەتیانە وەکو قوتابخانەی سەرەتایی بوون بۆ فێر بوونی بنەماکانی ئیسلام).

پاش پەرەسەندنی‌و بلاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام خواستی خوێندن‌و نووسین لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ‌و خەلیفەکانی راشدین رووی لەزیادی کرد، بۆیە مزگەوتەکان بوونە مۆڵگەی زانست‌و زانیاری مامۆستاو قوتابیان تێدا کۆدەبوونەوە لەمزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ (والمسجد الحرام)و لەمزگەوتەکانی تری جیهانی ئیسلام کۆبوونەوەی زانستیان وادەبەست باسی ئامۆژگاری‌و زانیاری تیا دەکرا.

دەڵێن یەکەمین کەس پاش پێغەمبەر ﷺ صەحابەیەکی پێغەمبەر ﷺ بووە بەناوی (تیم الداری) هەموو رۆژانی هەینی لەپێش داهاتنی کاتی نوێژ کۆری زانستی خۆی دابەستوودو بەردەوامیش بووە تاوەکو سەردەمی خەلیفەی سێیەم (عوسمان کوری عفان) ﷺ، پاشان داوای لێکردووە ماوەی بۆ زیاد بکرێ لەیەك هەفتە ببێتە دووجار، بەمەش خەلیفەی موسڵمانان رازی بووە، ئامانجی گشتی لەم دانیشتنانە بلاوبوونەوەی ئایین‌و رۆشنبیرکردنی گشتی بووە، لەگەڵ تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز.



پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ یارانی بەردەوام بووینە لەپەروەردە کردنی و ئامۆژگاری کردنی خەڵکی.(ابو وائیل) دەگێڕێتەوە دەڵێ (عبداللە ی کوڕی مەسعود) دەستووری وابوو هەموو رۆژی پێنج شەموان ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد. رۆژێك پیاوێك پێیگووت ئەی باوکی عەبدولڕەحمان! خۆزگەم هەموو رۆژی ئەم ئامۆژگاریانەت دەکردین. گوتی من لەبەر ئەوە واناکەم نەوەك وەڕستان بکەم، منیش وەك جارانی پێشووی پێغەمبەر ﷺ ناوبەناو پەندی دەداین و ئامۆژگاری دەکردین، نەبادا ئەگەر هەموو رۆژێ پەندمان بدا وەڕس بین، منیش ئێستا لەگەڵ ئێوە وادەکەم.

لەم وتەیەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش رۆڵی مامۆستای بینیوە لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، کەئەمانە لەجیهانی ئیسلامدا بە (قصاص) بەناوبانگن.

هەرکاتێك یەکێك لەمانە دەرسی دەگووتەوە لەسەر کورسیەك دادەنیشت خەڵکەکە لە دەوریان کۆ دەبوونەوە بۆ گوێگرتن ئەمانەش ناوبانگیان بە (اصحاب الکراسی) پەیدا کرد ئەم (اصحاب الکراسی)یانە لەهەموو شوێنێکی ئیسلامدا بوونیان هەبووە، یەکەم چینی مامۆستا بووینە ، هەڵبەتە ئەمانەش لەکاتی دەرس گرتنەوە پشتیان بە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر دەبەست یاخود بەمانایەکی تر بڵێین سەرچاوەی باسەکانیان لەبەرنامەی ئیسلامدا هەڵدەهێنا.

پاش شەهید بوونی (عوسمان کوڕی عفان) ﵁و دەست بەکاربوونی (علی کوڕی ابی تالب) ﵁ دەرس گوتنەوە چووە قاڵبێکی ترەوە چونکە لەشام (معاویە کوڕی ابی سفیان) داوای جیابوونەوەی دەکردو ئیعلانی دەوڵەتی ئەمەوی کرد بەبیانوی ئەوەی داوای‌خوێنی (عوسمان کوڕی عفان) ﵁ دەکا بۆیە کێشەو دووبەرەکی سەری هەڵدا لەنێوانیدا هەریەکەو لەلای خۆیەوە پاکانەی بۆخۆی دەکرد ئەمە رەنگی دایەوە لەمزگەوتەکان و کۆڕو مەجلسی مزگەوتەکان و قصاصەکان وەلەسەردەمی راشدین (٣) بزووتنەوەی زانستی سەریان هەڵدا:

١ بزووتنەوەی ئایینی ٢- بزووتنەوەی مێژوویی ٣- بزووتنەوەی ئەدەبی.

ئەم سێ بزووتنەوەیە هەر یەکێکیان شتێك هەڵکێش و تەواو کەری ئەوی تریان بووە هیچ کامێکیشیان لەچوار چێوەی ئەو بەرنامەیە دەرنەدەچوو کەئیسلام بۆی دەستنیشان کردبوو. بزووتنەوە ئایینی لەم بەشانە پێکهاتبوو کەپەیوەندییان بە بابەتە شەرعیەکانەوە هەبووە. بزووتنەوەی مێژوویی باسی ئەم بابەتە مێژووییانە بوو کەقورئان بۆمانی دەگێڕێتەوە وەکو باسی ئەو هۆزو نەتەوانەی لە مەوپێش هەبوونە. بزووتنەوەی ئەدەبی لەباسی شیعرو هونەر وەنەو باسە ئەدەبیانەی کەئەمر بەچاکەو دوورکەوتنەوە لەخراپە دەدوێ.

ئەحمد ئەمین لەکتێبی (مجر اسلام)دا دەڵێ (دەوڵەتی ئەمەوی بەهیچ جۆرێك هانی ئەم بزووتنەوانەی نەداوەو بەرەو پێش نەبردوون تەنها بزووتنەوەی ئەدەبی نەبێت کە دەرگایان بۆ شاعیرو وتار بێژەکان خستبووە سەرپشت چونکە دەوڵەتی ئەمەوی لەسەر بنچینەی زۆرداری دامەزرابوو تەنها (عمر کوڕی عەبدوالعزیز)ی لێدەرچێ کەسنووری ئایینی هەبوو و توند بوو بەرامبەر شاعیرەکان).

ئەم بزوتنەوانەی باسمان لێوە کرد لەسەردەمی راشدین و ئەمەویدا هەبووە هەمووشیان لەمزگەوتەکان سەریانی هەڵداوە. هەر لەمزگەوتەکانی شارە ئیسلامەکان وەکو (مەککە. مەدینە، کوفە، دیمشق، بەسرە) بێجگە لەمزگەوتەکانیش زۆرجار وارێك دەکەوت دەرس وتنەوەو خوێندن لەماڵی سەرکردەکان و والیەکان دەبوو، ئەمەش زیاتر بۆ کوڕە والیەکان وکوڕە خوا پێداوەکان کە مامۆستای تایبەتیان بۆگیراوە لەماڵی خۆیان فێری خوێندن و نووسین کراون ئەمانە شوێنی تایبەتیان پێ دەگوترێ. بەلام شوێنە



گشـتیکان لەجیـهانی ئیسـلام تەنـها مزگـ ـوتو (کتاتیب)کان بووە، کەهەموو خـەڵکی بـەبێ جیاوازی لەم شوێنە گشتییانە فێری خوێندنو نووسین کراون.

روی عن انس رضي الله عنه النبی ﷺ قال (ایها المؤدب من ولی ثلاثة صبیه من هذه الامة فلم یعلمهم بالسویه فقیرهم مع غنیهم حشر یوم القیامة مع الخائنین) ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەلە سەردەمی زووەوە (کتـاتیب)ی رێكو پێك هەبووە. کە رۆڵـەی موسـڵمانان بـەتێکرایی فـێری خوێنـدنو نووسـین کراون.

## رۆڵی مامۆستا لەئیسلامدا:-

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێت (انما بعثـت معلمـا) واتـە نـێردراوم بەمامۆسـتا بـۆ ئـەوەی دەوری فێرکەرێك ببینـم لەشـەوە زەنگـی تـاریکی خـەڵکی رزگار بکەمو بیان هێنمە سەر رێگای راست.

لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام مامۆستا شوێنو پلەی تایبەتی خۆی هەبووە لەناو کۆمـەڵگای ئیسلامیداو، ئەو مامۆستایانەش بـەکاری مامۆستایی خۆیان هەڵساون بێ ئەوەی چاوەڕێی پاداشی دونیـایی بن بەڵکو هەموو ئامانجێکیان رەزابوونی خوای گەورە بـووە. لەسـەردەمی ئیسـلامدا دەوڵـەت بـەهیچ شـێوەیەك سەرپەرشتی مامۆسـتای نـەدەکرد یـان بەمانایـەکی تـر بڵێـین مامۆسـتا لەلایـەن دەوڵـەت مووچەی بۆدابـین نـەدەکرا، وە دروسـتکردنی شـوێنی خوێنـدن لەلایـەن هیـچ دەزگایـەکی دەوڵەتـەوە دابـین نـەدەکرا وهـەروەها چاودێریکردنی مامۆسـتا نـەبوو لەلایەن دەوڵەت، بـەڵکو ئـەو چاودێری کـ دنـە تەنـها بۆ کەسایەتی مامۆستا خـۆی بـوو، ئەمـەش لەرایـە بەهێزەکانی (امام غزالی)یە کـەبڕوای وابـوو مامۆستا دەبـێ سـەربەخۆیی خـۆی هـەبێو پـاداش لـەخوا وەربگرێتـەوە پـاش ئـەوەی نـاڕێکی کەوتـە نـاوڕیزی موسـڵمانان، وایلێـهات باوکـان زیـاتر گـرنگـی بـە رۆڵـەکانیان بـدەن، بەتایبـەتی ئـەو کەسـانەی دەوڵەمەند بوون مامۆستای تایبەتیان دەگرت.

زانـای پـەروەردەیی (ابـن سـحنون) (٢٠٢-٢٥٦)ھ بەدوورو درێژی باسی لەمووچەی مامۆستا کردووە کە مووچەی مامۆستا رۆڵی گرنگی هەیـە لـەباری ئابووری پـەروەردە، ابـن سـحنون ئامـانجی سـەرەکی لەباسەکەیدا ئەوەیە کەدەبێ دامەزراوێکی سـەربەخۆ هەبێت کەجیا بێت لەمزگەوت، پرۆسەی پـەروەردەو فێرکردن سەربەو دامـەزراوە بێـتو توانیشی هەموو ئەو کەسانە رازی بکا کەدژی بوون، هەروەها ئاماژە بـەوە دەکـا دەبـێ مامۆسـتا بـەکاری خـێرکردن هەڵنەسـتێ خـەڵك هـەموو بەنـەخوێندەواری نەمێننەوە، لەهەمان کاتیشدا هەندێك ئەرکی لەسەر مامۆستا داناوە دەبێت داد پـەروەر بێت بەرامبـەر قوتابیەکانی چونکە ئەمانە ئەمانەتێکن دایكو بـاوك لەلای مامۆستای دادەنێ ئەم منداڵـە دڵو دەروونێکـی پـاکی هەیـە هیچـی تێـدا نەنووسـراوە وهیـچ نەخشێکی لەسەر هەڵنەکۆڵدراوە مامۆستا چۆنی بوێ وانەخشی دەکـاو دەبێـت لـەخواترس بێـتو نـابێت قوتابی بۆئیشو کاری خۆی بەکاری بهێنێ.

## چۆنیەتی دەرس گووتنەوە:

ئـەو مامۆسـتایانەی کەلـە مزگـەوتو کتاتیبـەکان دەرسـیان دەگووتـەوە زیـاتر شـێوازی دەرس گووتنەوەیان بەتاکە کەس بووە (انفرادی) واتـە هـەر قوتابیـەك لـەلای مامۆسـتایەکی تایبـەتی دەرسـی خوێنـدووە، ئـەم شێوەیە هەتا ئێستاش لە هەندێك شوێنی دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا بەردەوامە بەتایبـەتی لەمزگەوتەکان.

شێوەی حلقات (بازنەیی)ی دەرس گووتنەوە زیاتر دەچووە قـاڵبێکی کۆمـەڵی (جماعی) کاتێك مامۆسـتا دەرسی دەگووتـەوە خـەڵکانێکی زۆر کۆمـەڵ دەبـوون. مامۆسـتاش بـەردەوام دەبـوو لـەدەرس گووتنـەوە، مزگەوتیش لەلایەك جێگای نوێژکردنو خواپەرستی بوو لەلایەکی تر شوێنی دەرس خوێندن بوو.

ئەو دەرسانەی زیاتر گرنگی پێدەدرا لەجیهانی ئیسلامی زمان بوو، چونکە قورئان بەزمانی عـەرەبی



بوو وە بۆ ئەو قوتابیە موسڵمانەی شارەزایی پەیدا بکا لە تێگەیشتنی ئیسلام دەبووایە زمانی عەرەبی باش بزانێت. دیسان دەبوایە ڕێزمانی عەرەبی بزانێتو ڕەوا نبێژییەکی چاکیش بزانێت بۆئەوەی یەکی نەکەوێت لەکاتی قورئان خوێندندا هەروەها لەلایەنی ڕەوانبێژی وابوایە لەهەردوو مانای حەقیقیو مجازی قورئان بگەیشتایە هەروەها گرنگیدان بەئەدەب بەگشتی.

## ساڵی بەر خوێندن :

ئیسلام هەوڵی ئەوەی داوە. کەرێگای فێرکردن ئاسان بکات وەکو ئەوەی دەبینین دەرگای مزگەوت وکتاتیبەکانی خستۆتە سەر پشت بۆ هەموو کەسێكو بۆ هەموو تەمەنێكو بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان چینەکانی کۆمەڵ. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (اطلبوا العلم من المهد الى اللحد) جا لەسەر ئەم بنچینەیە دەبینین ساڵی دەستنیشانکردنی چوونی منداڵ بۆ بەرخوێندن لەئیسلامدا دەستنیشان نەکراوە. وەکو ئیمرۆ دەبینین کەدەبێ منداڵ لەتەمەنێکی دیاریکراو بچێتە قوتابخانەو ئەگەر تەمەنی لەم ڕادە دەست نیشانکراوە بەسەر چوو لەقوتابخانە وەرناگیرێ.

ئیسلام هەستی بەم ئەرکە کردووە کەلەسەری پێویست کراوە، ئەگەر لەسەردەمی منداڵیش بۆی ڕێك نەکەوت بخوێنێ ڕێگای خوێندنی نەگیراوە لە گەورەیی بخوێنێ.

پرسیاریان لە حەکیمێك کرد سنووری خوێندنو نووسین تا کوێیە؟

لە وەڵامدا گووتی تا ژیان مابێ.

پرسیاریان لە ابی عمر بن العلا کرد هەتاکەی باشە مرۆڤ بخوێنێ؟

فەرمووی مادام لە ژیاندا ماوە لەسەری پێویستە بخوێنێ.

بوخاری دەگێڕێتەوە دەڵێ: (زانایانی موسڵمان هێندە سووربووینە لەسەر خوێندن ئەگەر گومانیان لە مەسەلەیەکی زانستی هەبوایە هەوڵیان بۆ دەدا ئەگەر لەناو جێگای مردنیش بووبن).

ئەو ساڵەی کە منداڵ تێدا دەست بە خوێندن دەکا هیچ دەقێکی لەسەر نیە کە دەبێ منداڵ لە چ تەمەنێکدا بخوێنێ. جاری وەها بووە منداڵی خاوەن بەهرە لە تەمەنی (٥) ساڵیدا چۆتە بەر خوێندن هی وابووە لە تەمەنی (٧-٨) ساڵیدا دەستی بە خوێندن کردووە، بەڵام ئەو منداڵانەی لە کاتی ئاسایی دەستیان بە خوێندن کردووە لە تەمەنی (٧) ساڵیدا بووە ئەم تەمەنە بە گونجاو زانراوە. چونکە منداڵ لەم تەمەنە پێویستی بە کەس نابێت هاتو چۆی قوتابخانەی پێبکاو دەتوانی خۆی ڕابگرێ لە ماڵو دایكو باوکی دووربکەوێتەوە. (حاج عبد ربه) دەڵێ (لەسەر مامۆستا پێویستە دەستنیشانی ساڵی خوێندنی منداڵ بکا) بە مانای ئەوە هەندێك منداڵ خاوەن بەهرەن هەر لە زووەوە بەهرەی زیرەکییان پێوە دیارە توانای وەرگرتنی بابەتی زانستیان هەیە. بەڵام هەندێکیتر بە پێچەوانەوە بەهرەی زیرەکیان پێش کەوتوو نیە دەبێ لەکاتی تەمەنیخۆیاندا بخوێنن.

سەلەفی صالحین (ر.ض) منداڵەکانی خۆیان لە تەمەنی (٧) ساڵیدا ڕەوانەی خوێندنیان کردوون ڕەنگە زیاتریش هۆیەکەی ئەوە بێت کە منداڵ لە تەمەنی (٧) ساڵیدا ئەمری بە نوێژکردن پێ کراوە. هەر وەکو پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ (مروا اولادكم بالصلاة هم ابناء سبع واضربوهم هم ابناء العشر وفرقوا في المفاجع) دیارە منداڵ لەم تەمەنە دەتوانێ شت فێربێو شت وەربگرێ شت لەبەر بکا.

---

**سەرچاوەکان :-**


١. قورئانی پیرۆز
٢. تاج لأصول
٣. احياء علوم الدين
٤. اهداف التربية عند المسلمين
٥. تأريخ التربية والتعليم في اسلام



# ئەو ئافـــرەتـــەی کە بەقورئان دەدوا

ئامادەکردنی: شیرین ئیبراهیم محەمەد ئەمین

عەبدوڵڵای کوڕی(موبارەك) دەفەرموویێت

کاتێك کەوتمە ڕێ بەمەبەستی حەجی ماڵی خواو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ کەوتبوومە سەرچەند ڕێگەیەكو وام هەست نەکرد ڕێگام لێگۆڕاوە، لەم کاتەدا چاوم بەپیرەژنێك کەوتوو سڵاوم لێکرد ئەویش وەڵامی دامەوەو فەرمووی: (سلام قولا من رب رحیم) سڵاویکە کەفەرموودەی خوای بەبەزەییە، پاشان پێم وت: خودا ڕەحمت پێبکات چی دەکەیت لەم ڕێیە داوا کارت چییە؟ پیرەژنەکەش فەرمووی(ومن یضلل الله فلاهادی له) واتە هەرکەسێك خوای گەورە ڕێی لێوون کات ڕێ نیشاندەری نیە، عبدولڵای کوڕی مبارەك دەڵێ: لەمەوە بۆم دەرکەوت کە ئەو پیرەژنە ڕێی لێوون بووە بۆیە وتم: کوێت دەوێتو بۆ کوێ دەچیت؟ فەرمووی( سبحان الذی اسری بعبده لیلا من المسجد الحرام الی المسجد الاقصی) واتە پاكو بێگەردی بۆ ئەم خوایەی کە بەندەیخۆی بەشەو لەمزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی اقصی(بیت المقدس) خستە ڕێ منیش لەوەوە بۆم دەرکەوت کە حەجی تەواو کردووەو بەرەو بیت المقدس دەڕوات من بەردەوام بووم لەپرسیاری سادەو ئەویش بەردەوام بوو لەوەڵامی شیاوو بەهێزو ڕێك ئینجا پێم وت: چەنێکە لەم جێگایە دایت؟ فەرمووی(ثلاث لیال سویا) واتە سێ شەوی تەواوە، وتم هەرچی سەرنجت دەدەدم خواردنو خواردنەوەت پێنیە تاوەکو پێی بژیت وتی: (هو یطعمنی ویسقینی) واتە تەنها خوایە لەخواردنو خواردنەوە تێرم دەکات هەروەها پێم وت: ئەی بەچی دەست نوێژ دەگریت؟ فەرمووی(فان لم تجدوا ماء فتیمموا صعیدا طیبا) واتە ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بەخۆڵێکی پاكو چاك تەیەموم بکەن. منیش بەوەڵامەکانی زۆر قانیع بوومو وتم: ئەوە من خواردنم پێیە بابتدەمێ بیخۆیت. فەرمووی(ثم أتموا الصیام الی اللیل) وتم باشە خۆ ڕەمەزان نییە. فەرمووی(ومن تطوع خیرا فأن الله شاکر علیم) واتە هەر کەسێك بەئارەزووی خۆی بەڕۆژوو بێت چاکترەو وتم: باشە خۆ ئێمە بۆمان هەیە کە لەسەفەردا ڕۆژوو بشکێنین، فەرمووی(وان تصوموا خیر لکم ان کنتم تعلمون) واتە: ئەگەر بەڕۆژووش بن خێری زیاترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن، لەم گفتوگۆیەدا دیمەنی ئەو ئافرەتە سەرنجی ڕاکێشامو پێم وت: بۆ بەم شێوەیە قسە ناکەیت کە من قسەت لەگەڵ دەکەم، فەرمووی (مایلفظ من قول الا لدیه رقیب عتید) واتە هیچ وتەیەك نیە جگە چاودێرێکی بەهێزی لەسەرە، وتم: باشە تۆ لەچ تیرەو هۆزێکیت؟ فەرمووی(ولاتقف ما لیس لك به علم ان السمع والبصر والفؤاد کل اولئك کان عنه مسؤلا) واتە: لەشتێك مەدوێ کە زانیاریت پێی نیە، چونکە بیستنو بینینو دڵ هەموویان بەر پرسیارن لێیان، وتم: کەوتمەوە هەڵەوەو بۆم چارەسەر بکە فەرمووی(لاتثریب علیکم الیوم یغفر الله لکم) واتە لۆمەتان لەسەر نیە ئەمڕۆ خوای گەورە لێتان خۆش دەبێت. پاشان وتم: یارمەتیت بدەم سەرکەویتە سەر وشترەکەم هەتاوەکو بگەین بەکاردانەکەت وتی: (وماتفعلوا من خیر یعلمه الله) واتە: هەرشتێك ئێوە پێی هەڵسن لەکرداری چاك خوای گەورە پێی دەزانێ پاشان وشترەکەم بۆ گرتو وتی(قل للمؤمنین یغضوا من ابصارهم) واتە بڵێ بەئیمانداران باچاویان بگرن منیش چاوم لەئاستیدا



نوقــاندو وتم ســەرکەوە لــەکاتێکدا دەیویســت سەرکەوێت وشترەکە لەدەستم دەرباز بووو رایکرد هەندێ لەجلەکانی ئافرەتەکەش دڕاو وتی: (وما اصابکم من مصیبة فیما کسبت ایدیکم) وتم: ئارام بگرە هەتاوەکو وشترەکە دەگرمو دەیهێنمەوە ئەویش فەرمووی(ففهمناها سلیمان) واتە پێغەمبەر سولەیمانمان تێگەیاند لەزمانی گیانداران منیش ڕۆیشتمو وشترەکەم گرتو هێنامەوە وتم سەرکەوە ئافرەتەکە سەرکەوتو فەرمووی(سبحان الذی سخر لنا هذا وما کنا مقرنین وانا الی ربنا لمنقلبون) واتە پاكو بێگەردی بۆ ئەو کەسەی بۆ دەستە مۆکردنی تاکو ڕێگای دوورمان بۆ نزیك بێتەوەو ئێمەش سەرەنجام بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە کە سەرکەوت فەرمووی (واقصد فی مشیك واغضض من صوتك) واتە با ڕۆیشتن ڕێكو پێك بێتو مەبەست دار بێتو دەنگ بەپێی پێویست بێت پاشان عەبدوڵلای کوڕی موبارەك وتی بەدەم شیعر خوێندنو ورتە ورتێکەوە کەوتمە ڕێ. دیسان فەرمووی(اقرءوا ماتیسر من القرآن) واتە قورئان بخوێنە کە مایەی دڵخۆشیو دڵرفێنی مرۆڤە منیش وتم بەڕاستی تۆ خێرێکی زۆر گەورەت پێبەخشراوە ئەویش فەرمووی(وما یذکروا الا أولوا الالباب) واتە کەسێك بەمە نەزانێت کە خاوەن ژیرکاو هۆش بێت. عەبدوڵلا دەڵێت لەکاتێکدا لەسەرخۆو وردە وردە دەڕۆیشتم پرسیارێك هات بەبیرمداو وتم: باشە تۆ مێردت هەیە؟ ئافرەتەکە فەرمووی(یا ایها الذین آمنوا لاتسألوا عن اشیاء ان تبد لکم تسؤکم) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هەیە پرسیار لەهەندێك شت مەکەن ئەگەر بۆتان بەیان بکرێت زیانتان پێدەگات پاشان منیش دەنگم لەخۆم بڕیو ڕۆیشتینو گەیشتینە بەکاروانەکەو وتم ئەمە کاروانەکەیە کە لێیدابڕاوین کێی تۆی تێدایە فەرمووی( المال والبنون زینة الحیاة الدنیا) واتە: ماڵو منداڵ جوانی ژیانی دونیایە لەمەوە تێگەیشتم کە منداڵی ئەم ئافرەتەی تێدایە وتم باشە ئەوان چ پەیوەندییان هەیە بەحەجو بۆچی هاتوون؟ هەروەها بۆم دەرکەوت لەمنداڵێکی زیاتری ئەم ئافرەتەی تێدایە فەرمووی( وعلامات وبالنجم هم یهتدون) واتە بەو نیشانانەو بەو ئەستێرانە دەرك بەم ڕێگە دەبەن. دیارە منداڵەکانی ئەم ڕێیە نیشاندەری کاروانەکە بوون پاشان گەیشتینە چەند قوچەكو کۆشكو تەلارێك. وتم ئەم کۆشكو تەلارانە کێی تۆی تێدایە؟ وتی(واتخذ الله ابراهیم خلیلا) (وکلم الله موسی تکیما) (یایحیی خذ الکتاب بقوة). هاوارم کرد ئەی ئیبراهیم ئەی موسی ئەی یەحیا لەم کاتەدا چەند گەنجێکی جوانو نوورانی وەڵامیان داینەوەو هاتن بەدەممانەوە ئێمەش چووینە لایانو دانیشتینو ئافرەتەکە گووتی(فابعثوا احدکم بورقکم هذه الی المدینة فلینظر ایها ازکی طعاما فالیأتکم برزق منه) واتە: بایەکێکتان بڕوات بەو پارەیە هەندێك خواردنی چاك بهێنێت. یەکێکیان چوو خواردنەکەی هێناو لەبەردەمیان دانا ئافرەتەکە فەرمووی( کلوا واشربوا هنیئا بما اسلفتم فی الایام الخالیة) واتە: بخۆنو بخۆنەوە بەخۆشبەختانە لەوەی کە بەسەرتان برد لەڕۆژانی ڕابردوو عەبدوڵلای کوڕی موبارك وتی ئێستا ئەم خواردنەی ئێوە لەسەر من حەرامە هەتاوەکو لەم کارە ئاگادارم نەکەن. کوڕەکانیش وتیان ئەم دایکەمان ماوەی چل ساڵە بەقورئان نەبێت قسەی نەکردووە لەترسی ئەوەی نەوەك خوای گەورە لێی بڕەنجێو نارەحەت بێت. جا پاكو بێگەردی بۆ خوای گەورەو خاوەن دەسەڵات کە هەر کارێ ویستی بێت دەیکات، عەبدوڵلای کوڕی موبارك منیش پێم وت(ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء والله ذو الفضل العظیم) واتە: ئەمەش فەزڵو ڕەحمەتو بەرەکەتی خوای گەورەیە بۆ هەر کەسێك بیەوێت پێی دەبەخشێتو خوای پەروەردگاریش خاوەنی فەزڵو بێپایانی گەورەیە.

---

**سەرچاوە:** کتێبی أنیس المؤمنین.



# ڕێنماییەکانی گفتوگۆکردن

دلاوەر حەسەن قادر میران

لەئیسلامدا هەمووشتێك بەرنامەو ئادابی خۆی بۆ دانراوە، هیچ شتێك نەماوە قورئانی پیرۆز ڕوونی نەکردبێتەوە (تبيان لكل شيء) لەوشتە هەرە گرنگانەش قسەکردن و گفتوگۆیە.. گفتوگۆ لەئیسلاما زۆر بەجێ و ڕێ باسی لێوە کراوە، قورئانی پتەو ئامارەی بۆ کردووەو پێغەمبەری ڕێزداریش ﷺ تەفسیری پێداوەو دەستنیشانی جۆرەکانی کردووە، بەنموونە لەبەرزکردنەوەی دەنگدا خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار کردۆتەوە بەوەی دەفەرمووێ:

١- ﴿ **واقصد في مشيك واغضض من صوتك ان أنكر الاصوات لصوت الحمير**﴾ (لوقمان١٩) واتە با ڕۆیشتنت لەسەرخۆو مام ناوەندی بێت و مەبەستیشت هەبێت لە ڕۆیشتنەکەدا، هەروەها دەنگیشت نزم بێت و بەرز نەکرێتەوە چونکە بەڕاستی ناخۆشترین دەنگێك دەنگی کەرە (گوێ درێژ)..

٢- خوای گەورە بەندەکانی ترساندووە لەوەی دەیلێن هەرگیز درۆ نەکەن، واتە دەدێ قسەو ڕەفتارتان وەکو یەك وابێ ئەوەتا بەشێوەی پرسیار دەفەرمووێ: ﴿ **ياأيهاالذين أمنوا لم تقولون مالاتفعلون**﴾ (الصف٢) واتە ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی ئەوانەی بەقسە دەیگوتن بەڕەفتار جێبەجێی ناکەن؟ کەئەمەش هەم هێمای ترساندن، هەمیش هێمای وەبیرخستنەوەیە.

٣- هەروەها نابێ بەهیچ شێوەیەك لەشتێك قسەبکەی و خۆت تێ هەڵبقوڵێنی کەزانست و زانیاری و تەجروبەت لەو شتە نەبێت بۆیە خوای کاربەجێ بەشێوەی فەرمان دەفەرمووێ ﴿**ولاتقف ماليس لك به علم**﴾(الاسراء ٣٦). واتە بۆ شتێك مەوەستەو قسەی لێ مەکەو خۆت بەدیار مەخەو سنگت مەبەپێشێ کەهیچ زانیاریەکت لەبارەی نیە.

٤- ئەگەر هاتوو سێ کەس لەڕێیەکدا بەیەکەوە دەڕۆیشتن نابێت دووانیان بەچرپەیان بەزمانێك قسە بکەن کەسی سێیەم لێیان حاڵی نەبێت چونکە هەم تووڕە دەبێت بەوەی کەوا شتی لێ دەشاردرێتەوە،هەمیش هەست بەغەریبی و تەنیایی دەکات بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (اذا كنتم ثلاثة فلا يتناجى اثنان دون الاخرة حتى تختلطوا الناس فانه يحزنه ذلك) (البخاري ومسلم) واتە هەرگیز ئەگەرسێیان بوون دووانتان بزمانێك قسە نەکات ئەوەی تر لێی حاڵی نەبێت هەتا دەگەنە ناوخەڵکانی تر چونکە ئەم ڕەفتارەکەسی سێیەمی دڵپەست و نیگەران دەکات.

٥- پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین بەقسەی چاکە چونکە بەخێرو سەدەقە بۆمان دەنووسرێت هەتا ئەگەر یەك و شەش بێت بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ (إتقوا النار ولو بشقه تمرة فمن لم يجد فبكلمة طيبة) (مسلم) واتە خۆتان



لەئاگر بپارێزن هەتتا ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بێ ئەگەر هەر نەشبوو بەقسیەیەکی باش و چاك و خاوێن.. پتر لەوەش لەسەری بەردەوام بوودو ئاگاداری کردووینەوە کەخۆمان لەقسەی خراپ بپارێزین، بێدەنگییش یەکێکە لەخۆپارێزییەکان، ئەوەتا دەفەرمووێ (من کان یؤمن باللە والیوم الاخر فلیقل خیرا أو لیصمت)(الشیخان) واتە ئەگەر یەکێکتان باوەڕی بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە با کەقسەی کرد بەخێر بیکا یانیش بێ دەنگ بێت...

٦ خوای گەورەوکارجوان ئاگاداری کردووینەوە وپێمان دەگەیەنێ کەخۆمان لەقسەی پڕو پووچ و بێجێ دوور بخەینەوە چونکە هەم بێ فەرمانیی خودای گەورەیەو هەمیش دەبێتە مایەی ڕیسوا بوونمان لەنێو خەڵك، بۆیە دەفەرمووی لەقورئانا: ﴿قد افلح المؤمنون الذین هم في صلاتهم خاشعون والذین هم عن اللغو معرضون﴾ (المؤمنون٣) واتە ئەو باوەڕدارانە ڕزگاریان بووە لەسەر ی خوا کەلەنوێژەکانیان بەئاگاو بەترس و ڕوو وەرگێڕو دوورە پەرێزیشن لەقسەی پووچ و بەتاڵ..

٧ لەهەمووشیان گرنگتر پێویستە لەکاتی قسەکردنا خۆ بەکەمزان و ملکەچ بین نەوەك خۆ بەزل زانین بمان گرێت و ئاگاداری گەورەیی خوداش نەبین بۆیە پێغەمبەری بەڕێز (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی (من تواضع لله رفعه الله) (أبو نعیم) واتە هەرکەسێك ملکەچ بێت بۆخودا ئەوا خودای گەورەو کار بەجێ بەرزی دەکاتەوە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا انت
استغفرك واتوب الیك
وصلی الله علی نبینا محمد وعلی اله وصحبه
اجمعین

# لەیادی دەیەمین ساڵەی جاڕدانی ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ

## نیهایەت بورهان

هەڵبەت ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ ڕێککەوتننامەیەکی نێو دەوڵەتییە کەمافەکانی منداڵ دەستنیشان دەکات و داکۆکی تەواو لە مافەکانی منداڵ دەکات بەتایبەتی ئەو منداڵانەش دەگرێتەوە تەمەنییان لەخوار هەژدە ساڵییەوەیە ئەمەو ڕێککەوتننامەکە لەدوو تویی چل و یەك بەندی تایبەت بەمافەکانی منداڵ، وەك یاسایەکی نێو دەوڵەتی جیهانی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە داڕێژراوە سەبارەت بەکۆمەك و پاراستنی منداڵ و دابین کردنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکانی وەك خوێندن و بواری تەندروستی و توانا و کەسایەتی و گرنگیدان بە بەهرەو ویست و داخوازی و ئارەزوویییان لەژینگەیەکی پڕ لەبەختیاری و خۆشەویستی و لێك تێگەیشتندا، هاوکات ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ لەبەرواری ١٩٨٩/١١/٢٠ لەلایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بڕیاری لەسەر دراوەو پاش یەك ساڵ بەر لە بیرۆکەی ئەم بڕیارەو لەبەرواری



۱۹۹۰/۹/۲ چۆتە قۆناغی جیبەجیکردنەوە هەلبەت ئەمەش کەمترین ماوەیە کەریککەوتننامەیەك دەربارەی مافەکانی مرۆڤ تیایدا گەیشتبیتە قۆناغی جیبەجیکردن.

شایانی باسە ئەم ریککەوتننامەیە دەبیت لەهەموو ولاتاندا(بەکوردستانیشەوە) بەیرەو بکریت چونکە ئەم ریککەوتنە دیدیکی تازە بۆ مندالان دەخولقینی لەبەر ئەوەی مندالیش لەمرۆڤ لەدایك دەبیتو گەورە دەبیو هاوکات خاوەنی مافی خۆیەتی، داکۆکی لەبوونو ماهیەتی کەسایەتی بکریو نەچەوسینریتەوە ئەمرۆش لەکوردستان لەیادی (دەیەمین) سالرۆژی مۆرکردنی ئەم ریککەوتننامەیە کەلەرۆژی۱۹۸۹/۱۱/۲۰ داو لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بریاری جیبەجیکردنی دراوە، وەزارەتی تەندروستی و کاروباری کۆمەلایەتی بەچاودیری بەریز سەرۆکی حکومەتی کوردستانو بەئامادەبوونی بەریز (د.شەفیق قەزاز) وەزیری یارمەتیو مرۆڤایەتیو هاوکاریو نوینەری سەرۆکی حکومەتو ژمارەیەکی زۆر لەوەزیرو بریکارە بەریزەکانو بەرپرسانی حکومیو حزبی لە سنووری کابینەی سییەمی حکومەتدا لە گۆرەپانی وەزارەتی تەندروستی لە پایتەختی هەریمی کوردستان ئاهەنگیکی قەشەنگی تایبەت بە جاردانی ریکەوتننامەی مافەکانی مندالو قۆناغەکانی جیبەجیکردنی بریارەکە ساز کرد.

شایانی باسە قوتابخانەکانی هەرێمی کوردستانیش بەم بۆنەیەوە وێڕای سازدانو ڕێپێوانی مندالان لەگەلەری میدیا بەچاودێری بەڕێز پارێزگاری هەولێر، ڕێکخراوی مندال ساریزی بەریتانی (SCF) پێشانگایەکی تایبەت بەنیگاری دەستکردی بۆمندالان کردەوە.

هەلبەت ئەم ریککەوتننامەیە ئیستا زۆر لەولاتە جیهانیەکاندا جیبەجیکراوەو دەکریت، بەو ئومیدەی لەکوردستانی خۆشماندا، ئەم ریککەوتننامەیە بگریتە ئەستۆو بگەیەنریتە قۆناغەکانی کارپیکردنییەوە، چونکە مندال نە بەتەنها مولکی خیزانەکەیەتی ونە بوونەوەریکی بی توانایە، بەلکە مندال وەك مرۆڤیکی ئاسایی لەدایك دەبیتو لەگەل خیزانو دەوروبەرەکەشیدا گەشەدەکات. هاوکات ئەم ریکەوتننامەیە مندال وەك تاکیکی کۆمەلو کۆمەلگای مرۆڤو ئەندامیکی کارای خیزان سەیر دەکات کەخاوەنی مافو بەرپرسیەتی خۆیەتی.

بۆیە ئیمەش ئەمسال لەیادی (۱۰)یەمین سالەی مۆرکردنی و جاردانی ریککەوتننامەی مافەکانی مندال بەناوی خۆمو دایکانەوە جوانترین پیرۆزبایی لەمندالانی کوردستانو بریاردەرە بەریزەکانی ئەم ریککەوتننامەیە دەکەینو دەلیین: خۆزگە بەندەکانی ئەم ریککەوتننامەیە بەسەر مندالانی کورستانیشدا جیبەجی دەکرا تا مندالانی ئیمەش چیتر لەژیر زەبرو زەنگی دابونەریتی کۆمەلگاو زولمی رژیمە یەك لەدوایەکەکانی عیراقدا دەچەوسینرانەوە.

*** پیکەوە بەرەو بنیاتنانی سەیوانە ولاتیکی پە پوولەیی بۆمندالانی کورد.**

*** پیرۆزبیت دەیەمین سالەی جاردانی ریککەوتنامەی مافەکانی مندالان لەمندالانی کوردستانو جیهان.**

*** بژی مندال.. ئەوەو پیاوانی دوا رۆژی ئەو میللەتە..**






# قوببە

ئا: ئەندازیار: کەوسەر سابیر بەرزنجی

(قوببە) ئەو ساختمانە گەورەیەیە کە لەناوەراستدا بەشێوەیەکی بازنەیی بۆ سەرەوە قوپاوەتەوە، (قەب) لەزمانی عەرەبیدا واتە سەرۆك هێز یاخێڵ، لەزمانی کوردیشدا (قوبەی شین) واتە بۆشایی ئاسمان عەرەبەکان ئەو شێوە ساختمانەیان لەرێگەی ئیسلامدا بۆ ئیسپانیا گواستۆتەوە بەناوی (کوبا)یان (کۆبێن) ئەم شێوە هونەری بیناسازییە لەنیمچە دوورگەی لایبریاوە بۆ هەموو ئەوروپا پەلو پۆی هاوێشت. زۆربەی زمانە ئەوروپیەکان وشەی قوببە بەم شێوەیە بەکاردێنن:



لاتینی: کوپا
- ئیتالی: کۆپۆللا
-ئەلمانیا: کۆپێك
- فەرەنسا: کوپۆل، کۆپا.
- ئینگلیزی: کۆپۆللا، کۆپ
-روسیا: کوپەل

واتە شێوە بیناسازیەکە بەهەمان شێوە گوازرایەوە ولاتەکانی جیهانیو تەنیا ناوەکەی کەمێك گۆرانی بەسەردا هات..

وشەی قوببە چ بەشێوە چ بە مانا شوێنی خۆی کردەوەو دەتوانین بڵێین کاری لەزمانانی جیانیش کردووە وەك وشەی (کەپ)ی ئینگلیزیو وشەی (کوپ) فەرەنسیو (کوپا)ی ئیتالی ئەمانە هەمووی مانای فینجان دەبەخشن هەروەها لەزمانی ئەڵمانیشدا وشەی (کۆپشن) مانای فینجان دەبەخشێ بەڵام پاشگری (شن) مانای بچوککردنەوە دەگەیەنێ. هەروەها وشەی (کۆپی) واتای لوتکەی شاخ دەگەیەنێ هەروەها وشەی (کەپ) واتای (کەللەسەر) دەدات ئەم وشانەی سەرەوە کەباسمان لێوەی کرد لەرەچەڵەکدا هەموویان دەگەرێنەوە سەر وشە عەرەبیەکە کە(قوببە)یە. لەزمانی کوردیشدا وشەی قوببە یا ((گومبەت) هەمان مانا دەبەخشێ هەروەك زۆربەی سەربانی مزگەوتەکاندا ئەوشێوە بیناسازییە بەرچاو دەکەون لەم چەند ساڵەی دواییشدا ئەم شێوە بیناسازییە شوێنی خۆی کردۆتەوە لەدروست کردنی خانوو بەرەی هاوولاتیان ئەمەش زیاتر بۆ جوانکردن و پیرۆز راگرتنی شێوەی بیناسازی ئیسلامە.

سەرچاوە:

* الاسلام والفن المعماری: تألیف د. محمد منذور القاهرة (١٩٨٤).



عسى ربكم أن يرحمكم وإن عدتم عدنا وجعلنا جهنم للكافرين
حصيرا ﴿٨﴾ إن هذا القرآن يهدي للتي هي أقوم ويبشر
المؤمنين الذين يعملون الصالحات أن لهم أجرا كبيرا ﴿٩﴾
وأن الذين لا يؤمنون بالآخرة أعتدنا لهم عذابا أليما ﴿١٠﴾
ويدع الإنسان بالشر دعاءه بالخير وكان الإنسان عجولا ﴿١١﴾
وجعلنا الليل والنهار آيتين فمحونا آية الليل وجعلنا آية
النهار مبصرة لتبتغوا فضلا من ربكم ولتعلموا عدد
السنين والحساب وكل شيء فصلناه تفصيلا ﴿١٢﴾ وكل
إنسان ألزمناه طائره في عنقه ونخرج له يوم القيامة كتابا
يلقاه منشورا ﴿١٣﴾ اقرأ كتابك كفى بنفسك اليوم عليك حسيبا
﴿١٤﴾ من اهتدى فإنما يهتدي لنفسه ومن ضل فإنما يضل
عليها ولا تزر وازرة وزر أخرى وما كنا معذبين حتى نبعث
رسولا ﴿١٥﴾ وإذا أردنا أن نهلك قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها
فحق عليها القول فدمرناها تدميرا ﴿١٦﴾ وكم أهلكنا من
القرون من بعد نوح وكفى بربك بذنوب عباده خبيرا بصيرا ﴿١٧﴾

من كان يريد العاجلة عجلنا له فيها ما نشاء لمن نريد ثم
جعلنا له جهنم يصلاها مذموما مدحورا ﴿١٨﴾ ومن أراد
الآخرة وسعى لها سعيها وهو مؤمن فأولئك كان
سعيهم مشكورا ﴿١٩﴾ كلا نمد هؤلاء وهؤلاء من عطاء
ربك وما كان عطاء ربك محظورا ﴿٢٠﴾ انظر كيف فضلنا
بعضهم على بعض وللآخرة أكبر درجات وأكبر تفضيلا
﴿٢١﴾ لا تجعل مع الله إلها آخر فتقعد مذموما مخذولا ﴿٢٢﴾
۞ وقضى ربك ألا تعبدوا إلا إياه وبالوالدين إحسانا إما
يبلغن عندك الكبر أحدهما أو كلاهما فلا تقل لهما
أف ولا تنهرهما وقل لهما قولا كريما ﴿٢٣﴾ واخفض
لهما جناح الذل من الرحمة وقل رب ارحمهما كما ربياني
صغيرا ﴿٢٤﴾ ربكم أعلم بما في نفوسكم إن تكونوا صالحين
فإنه كان للأوابين غفورا ﴿٢٥﴾ وآت ذا القربى حقه
والمسكين وابن السبيل ولا تبذر تبذيرا ﴿٢٦﴾ إن المبذرين
كانوا إخوان الشياطين وكان الشيطان لربه كفورا ﴿٢٧﴾



# هونەری خۆش نووسی و نووسینەوەی قورئانی پیرۆز

ئا: گەیلان خەتات

هەر لەکۆنەوە دیارە خۆشنووسان هەموو تواناو بایەخێکیان داوەتە وشە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزو وتە بەنرخەکانی پێشەوای ئیسلامو مرۆڤ( حەزرەتی محەمەد)ﷺ وەك ئەوەی خۆشنووسانیش ڕۆڵی خۆیان هەبێت لەپاراستنو خزمەتکردنێك بەئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆیە هەردەم هەوڵو کۆششیان کردووە کە لەرێگەی ئەو خزمەتکردنەوە نایابترین شت دروست بکەن ببێتە هۆی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیو لەبەر گوێی خەڵكو شەیدایانی ئەم هونەرە پیرۆزە چربەی بێ.

بۆ نموونە: ١- خۆشنووسێك بەناوی(محەمەد روح الله اللاهوری) دوو قورئانی پیرۆزی نوسیووەتەوە هەر یەکەیان کە لە(٣٠)سی لاپەڕە پێك هاتووە لەگەڵ ئەوەشدا لەهەر لاپەڕەیەکدا تەنها درێژی یەکەم دێڕ نەبێت درێژی دێڕەکانی‌تر هەر هەموویان سەرەتاکانیان بەپیتی ئەلف دەست پێدەکات.

٢- خۆشنووسێکی‌تر قورئانێکی لەسەر پێستی ئاژەڵ بەزێر نووسیوەتەوە بەپێوانەی (٨سم)×(٥سم).

٣- خۆشنووسێکی‌تر بەناوی(مصطفی کوری محەمەد) قورئانێکی نووسیوەتەوە کە لە(١٠)لاپەڕە پێك هاتووە.

٤- خۆشنووسێکی‌تر بەناوی(عەبدولرەحمان الصایغ) خاوەنی کتێبی (تحفة اولی الباب في صناعة الخط والکتاب) قورئانێکی نووسیوەتەوە بەخەتی(ثلث) بەماوەی(٦٠) ڕۆژ. درێژی هەر لاپەڕەیەك لەیەك مەتر درێژترەو پانی نزیکەی نیو



بەقەد درێژیەکەیەتی هەر لاپەڕەیەك بێك هاتووە لە(٩)دێڕ هەر سەرە سورەتو ئایەتێکیش بەزێڕ رازانراوەتەوەو نەخش کراوە(مذهبة ومنقوشة) بەڵام هەندێك لەخۆشنووسانی ئیسلام خەتیان لەسەر شتی زۆر بچووك نووسیوە رەنگە هەندێ کەس کەگوێ بیستی دەبن بڕوا نەکەنو بۆنەوەی زیاتر سەرنجی خەڵکی راکێشن لەخۆش نووسەکانی‌تر لەسەر دەنکە گەنمو هێلکەو جۆو شتی‌تر شتیان نووسیوە ئەوە بۆ نموونە خۆشنووسێك(قصار السور) واتە سوورەتە کورتەکانی لەسەر دەنکە برنج نووسیوە کە مرۆڤ ناتوانێ بەچاوی ئاسایی خۆی بیخوێنێتەوە(بالعين المجرده).

هەروەها قاسم غباری خۆشنووسێکە کە لەساڵی ١٠٢٤ی کۆچی... کۆچی دوایی کردووە لەگەڵ(محەمەد کوڕی مصلح الدين کوڕی ئیسماعیل) لەساڵی ١٠٨١ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە، هەردووکیان لەسەر دەنکە برنج سوورەتی(الاخلاص)یان نووسیوەتەوە.

پەنا بەیەزدانی مەزن ئەگەر تەمەن رێگە بدات شتی‌تریش دەخەینە بەرچاوی ئارەزومەندانی هونەری خۆش نووسی.

**سەرچاوە:**

الخط العربي تأريخه وانواعه
للمؤلف / يحي سلوم العباسي

# بچووکترین نوسخەی قورئانی پیرۆز

**ئا. بەدەسکارییەوە : خۆری ئیسلام**



لەو ماوەیەدا، دوو لاوی موسڵمانی عەرەبستانی سعوودی کە خولیامەندو ئارەزووی کۆکردنەوەو ئەرشیفکردنی بەرهەمی دەگمەنو شتی دانسقەیان هەیە، ئاشکرایان کرد کە وا بچووکترین نوسخەی قورئانی پیرۆزیان لەلا پارێزراوە کە درێژیەکەی (٢ر٢) سانتیمەترو پانیەکەی (٩ر١) سانتیمەترە. شایانی باسە ئەم دوو لاوە موسڵمانە سعودیە لە لێدوانێکدا بۆ دەزگاو کەناڵەکانی راگەیاندنی وڵاتەکەیان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کەوا ئەو نوسخە قورئانەیان لە باوانییانەوە بە (میرات) بۆ بەجێماوەو هیچ گۆڕانێکی نێگەتیفی خراپیان لە مەڕ دروستی جەستەی قورئانەکە بەسەردا نەهاتووە، ئێستاش وەك خۆیەتی. ئەمەو قورئانەکە هەموو ئایەتەکانی بە کاملی تێدایەو لەشاری قاهیرەی پایتەختی میسر چاپکراوەو بە دەستخەتی مامۆستای خۆشنووس (سەید محەمەد مستەفا) نووسراوەتەوە.

هاوکات ئەم دوولاوە خولیامەندو ئەرشیف دۆستە لە وتەیەکدا گووتیانە/ دوای ئەوەی ئەم نووسخەیەمان لەسەر تۆڕی (ئەنتەرنێت) بە مەبەستی (هەدیە فرۆشتن) نیشاندراوە، نرخو بەهای گەیشتۆتە (٧٥٠) هەزار دۆلار. کە خۆی لە خۆیدا ئەو نرخە دوا نرخ نیە، چونکە بگرە تا ئێستاش بڕیاری فرۆشتنو هەدیە کردنی یەکجارەکییان لەسەر نەداوە.

**سەرچاوە:**

*رۆژنامەی برایەتی ژمارە (٢٩٨٩) –دوالاپەرە ١٩٩٩/١٢/١٣



# موسڵمانانی چین چەند لایەڕەیەکی پڕشنگدار

ئامادەکردنی/ هادی وڵاتی

موسڵمانان توانیـان بگەنـە لانەی پاڵـەوانی زەردو ئـاڵای (لا الـه الا الله) بڵاوبکەنــەوە. ئێستا ژمــارەی موسڵمانانی چین دەگاتـە (٥٠) تـا (٧٠) ملیـۆن کـەس کەزۆربـەیان لەناوچەی (سینکیانگ) ئاکنجی بوونـە. لەباکووری چین خەڵکانی ئەم ناوچەیـە بەکەرەستە سروشتیەکان دەوڵەمــەندن، وەزمــانی نووسـینیان بەپیتـەکانی عەرەبییـە لـەدێر زەمانـەوە موسڵمانانی چین تووشی چەندەها قەسابخانە هاتوون، هەرچەندە بۆماوەیەك لەنێو ئاشتییەکی ڕێژەییـدا ژیاون دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی چین لەساڵی ١٣٢٥م بڕیارێکی دەرکـرد وتــی (ئیســلام ئـایینی حەقــە) هــەروەها دکتـۆر(سن یات سن) لەسـاڵی ١٩١١ز ڕایگـەیاند کـەوا موسڵمانان یەکێکن لەڕەگـەزی بنـەڕەتی پێنجەوانـەی کە دەستووری وڵاتی لەسەر دارێژراوە، ئێستاش دوای ئێش و ئازارێکی زۆر لـەژێر سایەی پاسـەوانی سوورو شۆڕشـی ڕۆشـنبیری، موسڵمانان توانیــان مافـەکانی ئایینی خۆیان بگەڕێننەوەو لاپەڕەیـەکی پڕشنگدار دەستی پێ بکەنەوە لەژیانیان، لەپشت دیواری چینی گـەورە ئــەوە دووپـات دەکەنــەوە کــەوا ئیسـلام لەمەترسیدا نیە.

لەپێنج ڕەنگ پێك هاتووە کەدەست نیشانی پێنج ڕەگەزی گەورە دەکات کەلەچین دادەژین لەخوارەوە بۆ سەرەوە بریتییە لە سوور، بۆچینی نـاوخو، ڕەش، بۆمەنشورییەکان، سپی، بـۆ موسـڵمانەکان، سـەوز، بۆتبتییەکان. زەرد بۆمەغۆلەکان دیرۆکی چین پڕە لەشتی سەرسوڕهێنەرو ڕووداو، شارستانییەتییەکەی دەگەڕێتــەوە بـۆ پێنــج هــەزار سـاڵ پێش زاییـنی لـەکۆندا دابـەش بـوو بـۆ چـەند خێڵێك هەریەکـەیان سەربەخۆییەکی تەواویان هەبوو بەڵام ئێستا دابەش




## (چـــیـــن)

کۆماری چینی میللی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ڕووبەرەکـەی (٣ر٤) ملیـۆن میلـە، بەیەکـەم وڵات دادەنرێت لەجیهاندا لەزۆری دانیشتوان کەدەگاتـە هـەزار ملیـۆن. دابــەش دەبێـت بـۆ سـی ڕەگـەز کـەبریتیین لـەچین، سـیکینك، تبـت. ئـاڵای چینـی



بووە بۆ سەر (٢٤)ولایەت.

وەئـەم ولایەتانـەش دابـەش بـووە بۆچـەند ناوچەیـەك ولوایـەك هەریەكـەیان خودموختـاری خۆیـان هەیـە، هـەروەها زیـاتر لـە (٥٥) كەمـە نەتەوایـەتی لـەچیندا دەژیـن، كـەتیایدا موسـڵمان ژمارەیـەكی زۆر پێكدێنـن. یەكـەم ئیمپراتوریـەت لـەچین لەسـاڵی (٢٣٥٧) پێـش زایـین دامـەزراوە. گرنگترین شوێنەواری بەناوبانگ تێدابە بۆ نموونە (دیـواری چـین) كەبەسەرسوڕهێنترین جیهانـەكانی حـەوت (عجـائب الدنیـا السـبع) دادەنرێـت، كەوائیمپراتۆریـەتی (شـن) دایمـەزراند لەسـەدەی سێیەمی پێش زایینی كەدرێژاییەكی دەكاتە ٢٨٠٠ كیلۆ مەتر، ئەمەش بـۆ پاراستنی وڵات بـوو لە دژی هێرشەكانی داگیر كەری خێڵەكانی مەنگۆلیای بـاكوور ئەم دیوارە تاكو ئێستاش هەرماوە.

## چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەچین

بیروراكـان جیـاوازن وجـۆراو جـۆرن دەربـارەی چۆنیـەتی هـاتنی ئیسلام بۆ نـاو چین. بـەڵام وایـێ دەچێ كەلەگەڵ بازرگانە عەرەبەكان موسڵمانەكانی هاتبێتە چین، بەتایبـەتی بـەهۆی ئـەو عەرەبانـەی كـەوا دەچوونـە بـەندەرەكانی چین بۆ كرینی كـەل و پەلی چینـی بەرامبـەر بەرهـەم هێنراودكانی هندیو ئەو بەرهەمانەی كەوا لەو وڵاتانە بەرهەم دەهێنران كـەوا لـەژێر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی ئیسـلامیدا بـوون، داكۆكی لەسـەر ئـەوە دەكرێ كـەوا چـین پێشـوازی لەیەكـەم نێراوەكـان كـرد لەسـەردەمی خەلیفـەی سێیەم عوسمانی كوری عەفان (ﷺ) ساڵی (٦٤٤-٦٥٥)م ئـەم نێراوانـە بـەردەوام بـوون بـەرێزەی نـێراوێك هـەموو چـوار ساڵ جارێك پەیوەندی باش دامـەزرا لەگـەڵ ئیمـپراتۆری چـین بـەهۆی ئـەم نێراوانـە لەسەردەمی ئیمپراتۆری چین (تـانغ) ئیسلام دەستی بەبڵاوبوونـەوە كـرد. قوتەیبـەی كـوری موسـلحی سـەركردەی وەلیـدی كوری عەبدولـەلیك (٧٠٥- ٧١٦) زایینـی دوای ئـەوەی كـە توانـی سـەمەرقەندو بوخـارای كـردووە لـەلای رۆژهـەڵاتی چینـەوە هاتـە پێشـەوە بـەڵام پاشگەزبووە ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بـۆ نائاسایی باری رامیاری وڵات كە نەدەگونجا لەگەڵ ئەم كردنەوەیـە گەورەیـەدا، بـەڵام لەسـاڵی ٧١٤ زایینـی گەیشتۆتە سنوورەكانی چین لـەلای (رۆژئـاواوە تـا شاری (كاشگر)ی داگیركرد.

لەسـاڵی (٧٥) موسـڵمانەكان تووشـی رووبـەڕوو بوونەوەیەك هاتن لەگەڵ سـوپای چینـی لەشـەڕی (طـلاس) لـەنزیك شـاری كاشـگەر وەلـەم شـەڕەدا موسـڵمانەكان سـەركەوتن و (٢٠) هـەزار لـە سەربازەكانی سوپای چین بەدیل گرت، لەنێوانیاندا زۆر پیشەمەندی تیادابوو.

لەسەردەمی (منصور)دا مەلیكی چین (سوتسون) پەنای بردە بەرسوپای منصور بۆ دامركاندنەوەی ئەو لەخو دەرچوونـەی كـەوا دووسـەركردەكانی مـەلیكی چین پێی هەڵسان كە لەتەتـەرەكان بـوون، لەسـاڵی ٧٥٧م مەنسـووریش چـەند هـەزار سـەربازێكی بـۆ رەوانـەكردو دوای ئـەوەی ئـەم لـەخو دەرچوونـە دامركێنرایـەوە زۆربـەی لەسـەربازە موسـڵمانەكان لـەچین داجێگیربوون، هـەر لەوێشدا ژنیـان هێنـا وەلەگـەڵ بازرگانـە موسـڵمانەكان بوونـە پێشـەوای پێشـكەوتنی ئیسـلامەتی لـەوڵاتدا، بەهـەزارەها اەموسـڵمانانی فـارس و توركسـتان هـەڵاتن لەترسـی سوپای مەغۆل و لەچیندا جێگیربوون.

موسڵمانەكان لەسـەردەمی مەغۆلییـەكان مـاف و تایبەتمـەندییان هـەبوو، چونكـە فـەرمان رەواكـانی مەغۆل رێژەیەكی كەم بوون كەچی رێژەی زۆرینەی دانیشتوان لـە نەتـەوەی(هان) بوون، جالەبـەر ئـەوە هەوڵیاندا بۆ دۆزینەوەی هاوسەنگییەك بۆ هێزەكانی لەناوەوەی چینـدا، دانیشتوانیان كـرد بـەچوار چـین (طبقـة) مەنغۆلییـەكان لەسـەرووی هەموویانـەوە، بەپلەی دووەم موسڵمانەكان بوون كـەپێیان دەگوتـرا خـاوەن چـاوە رەنگـاو رەنگـەكان بەپلـەی سـێیەم نەتەوەی (هان) پلەی چوارەمیش (نوبیەكان) چونكـە باشووری چین دوا شوێن بـوو كـە كەمەنغۆلییـەكان داگیریان كرد..



هـەندێك لەموسـڵمانەكان پلـەو پایـەی باشـیان وەرگرت لەوانە (أهاما) یان (احمد) كـەبوون بـەوەزیر (عەبدولرەحمان) بوو بەسـەرۆكی وەزارەتـی دارایـی، (یونغ) (قتـب الدیـن) بـوو بـەوەزیری ولات بـەڵام دیارترینیـان لەدەسـڵاتدارانی (یوان) (عومـەر شمـس الدین) بوو (سای دیان تشی شانس دیـن) كەشـورەتی دەركردبـــوو بـــە (ســـیدالاجل) لـــەماوەی دەســـەڵاتدارییەكەیدا هەســـتا بەدروســـت كردنـــی مزگەوت وقوتابخانە هەروەها خۆشـكردنی ڕێگاو بـان لەناوچـە شـاخاوییەكان دا، دروسـت كردنـی بـردو پـرۆژەی ئـاودێری، چـاك كردنـەوەی دانەوێڵـە، دامـەزراندنی پۆسـتو بـەرید، ئـەم كـە لـەپیاوە تائێستاش جێگای ڕێزلینانە لەناو خەڵكی (یوان).

لەساڵی ١٣٢٥م گـەورەی چـین بڕیـارێكی دەركـرد، دان نـان بەئیسـلام كـەوا دینێكـی هەقـەو ڕاسـتە، ئەمـەش لەپلـەو پایـەی ئیسـلام زیـاتر كـرد وای لەخەڵكی كرد كەبەكۆمەڵ بێنە ناو دینی ئیسـلامەوە لەهـەموو ولایەتـەكانی چینـدا لـەدوا سـاتەكانی ئـەم سـەردەمە، وەلەسـەردەمی دوای ئـەویش نەتەوەیـەكی موسـڵمانی چـین پێكـهات كەبەنەتـەوەی (هـوی) دەناسرێت كەزۆربەیان لەدەرەوەی چینـەوە هـاتوونو تێكەڵ بەكۆمەڵگای چینی بـوون كەهـەڵسو كـەوتیان وەكو هاووڵاتییەكی چینی وابوو نەك كەوا لەدەرەوەی ولات هاتوون وەزۆربـەیان نـاوی چینیـان هـەڵگرتووە بەپاڵ ناوە ئیسلامییەكەیان.

موسڵمانە چینییـەكان مانـای قورئـانی پیرۆزیـان لێكداوەتـەوە لـەڕێگای ئیمـامی مزگەوتـەكان ئـەم موسڵمانانە ماناكانی قورئـانی پیرۆزیـان كۆكردۆتـەوە لەپـەرتووكێكدا بـەناوی (خاتمة القـرآن) كەبریتییـە لەسورەتەكانی (الفاتحة، یس ، الملك، الطارق، الاعلى، الضحـى، الكـافرون، القلعـة، النـاس...) لـەدواییدا كۆمەلەیـەكی تـر سـەریهەڵدا (خاتمـة القـرآن) كـەوا مانای چەند ئایەتێكی لەسورەتی (البقرة، الفتح، یس جـزء عـم..) ڕافـەكراوە لەسـەرەتای سـەدەی (١٨) هـەم ژمارەی زانایان و ئیمامەكان موسڵمانان بـەردەو زیـادی ڕۆیشت لەنیوان (١٣) سـەدە لەبڵاوبوونـەوەی ئـایینی ئیسـلام لـەچیندا، ژمارەیـەكی زۆر لـەئیمامی چـین سەریان هەڵدا كەخەریكی لێكۆڵینـەوەی ئـایین بـوون، زۆر لەم زانایانە سەردانی حیجازو میسریان كـرد بـۆ بەجێگەیاندنی فـەریزەی حـەج یـان بـۆ خوێنـدن لەئەزهـەری شـەریف. بـەڵام تـەواوترینو بـەپێزترین تەفسیری قورئان لـەنیوەی ئـەم سـەدەیە بەدیاركـەوت كەمامۆسـتا (محمـد مكـین ماجیـان) كەلەئەزهـەر خوێندویـــەتی هەڵســـاوە بـــەوەرگێڕانی ، ئـــەم وەرگـێڕدراوە لەسـاڵی ١٩٥٢ هاتەكایـەوەو تائێسـتا بەسەرچاوەیەكی بنەڕەتی دادەنرێت بۆ موسڵمانانی چین.

## سەربڕینی بەكۆمەڵ (مذابح بالجملة)

بەدرێژایـی سـەردەمەكانی جۆراو جۆر كوشـتنو سـەربڕین ڕێگـای لەبڵاوبوونـەوەو پێشـكەوتنی ئیسلامەتی گرت كە موسلمانەكان تووشی دەهـاتن لەسـەردەمی دەسـەڵاتداری (المانشـو) (١٦٤٤-١٩١١ز) كەبەسـەر سـەخترین دوژمنـی ئیسـلام دادەنرێـن. موسڵمانەكان تووشـی جـەنگی لـەناو بـردن بـوون لـەباكوورو بـاكووری ڕۆژئـاوا (مانشـوا) (١٠ملیـون) موسڵمانی بەكوشتدا لە١٠ی ئۆكتۆبـەری سـاڵی ١٩١١ز كاتێ كـە كۆمـاری (الجمهوریـة) ڕاگـەێنرا لـەچین، موسڵمانەكانی باشـوور هـەرزوو بـەزوو ڕەزامـەندی خۆیان دەربڕی بۆ ئەم ڕاگەیاندنە. د.(سن یات سن) داوای لەموسـڵمانەكان كردبـوو پشـتگیری خۆیـان دەربـڕن بـۆ ئـەم كۆمـارە (الجمهوریـة) وەهاریكـاری شۆڕشەكە بكـەن لەبەرامبـەر ئەمەشدا وای لـەدكتۆر (سـن یـات سـن) كـرد كـەدان بەموسـڵمانان بنـێو بەیـەكێك لەبنـەماكانی پێنجەوانـەی كـە ولات بەهۆیـەوە بـەڕێوە دەچێـت لەسـاڵی ١٩٥٧ز لەپـەكین كتـابێك دەرچـوو بـەناوی (چینـی ڕزگـاركراو) لـەم كتابەدا باسی ژیانی موسڵمانان دەكات كەچۆن ئـازارو ئەشكەنجەیان لەژێر دەسەڵاتی چین خواردووە.

كتابەكـە ئـەوەمان بـۆ بـەیان دەكـات كـەكاتێ موسـڵمانەكان داوای مـافی ڕەوای خۆیانیـان دەكـرد لەژیان بەهەزارەها سەربڕان لەنێوان ساڵانی ١٩٣٠-١٩٤١



ئەم قەسابخانانە سەرەڕای بوونە هۆی هەزاریو رووخاندنی مزگەوتەکان لەشیوشین و یکینو موشیاو شوبخ و زۆر لەجێگاکانی تر. بووە هۆی ئەوەش کەوا لەموسڵمانەکان بکات کەپشتگیری خۆیان رابگەیەنن بۆ هێزە نیشتمانییەکان بەسەرۆکایەتی (ماو) ئەویش بەخۆپیشاندانێك کەبووە هۆی لەناوچوونی هەزارەهای تر لەموسڵمانەکان سەرەڕای ئەم هەموو نەهامەتییانەش موسڵمانەکانی (بەتەوەی هۆی) توانییان سوپایەك پێك بهێنن کەناسرابوو بە (کۆمەڵانی ئاسنین) کەئەفسەرێکی موسڵمان بەناوی (هابن تشای) سەرکردایەتی دەکرد، زۆر لەهەوڵەکانی (سینکیانج) ی پوچەڵ کردەوە.

## هێمنییەکی کاتی (هدنة مؤقتة)

ساڵانی رابردووی لەنێوان (١٩٠٠-١٩٤٩) سەرەڕای کارەساتەکان وەکو قۆناغێك وابوو بۆ موسڵمانەکان بۆ بەخۆداچوونەوە، پەیمانگاکانیان و قوتابخانەکانیان لەزیاد بوون دابوون، کۆمەڵەکانیان پشتگیری لێدەکراو فراوان دەبوون، پەیوەندییەکانیان نوێ دەبووە لەگەڵ جیهانی ئیسلامی. کۆمەڵانی ئیسلامییە ناوخۆکان هەنگاوێکی باشیان نارد لەناردنی شاندێکیان بۆ خوێندن، ژمارەی ئەوانەی کە لە (ئەزهەر) خوێندویانە لەنێوان ساڵانی (١٩١١-١٩٤٩) گەیشتە ٣٥ کەس هەندێك کتێبەکانی ئیسلامی بەچاپ گەیەنران، زۆرلەزانایانی موسڵمانان سەریان هەڵدا لەو ماوەیەدا لەوانە: (وانغ جینغ تشای) کە پێش نوێژو فێرکەرو سەردەستەی گۆڤاری روونکی ئیسلام بوو کەخۆی وخێزانەکەی دایانمەزراندووە.

شێخ (محەمەد تواضع یانغ شی کشیان) زانایەکە لەئەزهەر خوێندوویەتی لەساڵی (١٩٥٨)دا کۆچی کردووە بەیەکەم کەس دەژمێردرێت کەجووەتە ئەزهەر بۆ خوێندن. یەکەم کەس بوو کە بیتەکانی چاپ کردنی عەرەبی هێنا بۆ ناوچین. کتێبێکی داناوە بەناوی (بیرەوەری نۆساڵ لەمیسر) (مێژووی یاسادانان لە جیهانی ئیسلامیدا) وەرگێراوە. هەروەها شێخ مالیانج جیون، مامۆستا محمد مکین. هتد..

خۆماڵی کردنی چالاکی ئیسلامی (تأمیم النشاط الاسلامی)

کەسەرۆك (ماو) هاتە پەکین لە(١١)ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٩زایینی، سەرکردایەتی تازە لەم ساڵەدا وەلەساڵانی دوایی بەزمانی شۆڕش هەڵس و کەوتیان دەکرد، لەسەر حساباتی فەرهەنگی زمانی وڵات مومارەسەی نەبوو.

لەژێرسایەی ئەم کە ش و هەوایەدا مەسەلەی موسڵمانان بایەخێکی وای نەبوو تەنها بەئەندازەی چاکردنی پەیوەندییەکانی چین نەبێت لەگەڵ وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، لەلایەکی تریشەوە هیچ هۆیەك نەبوو کەببێتە دڵەراوکێی موسڵمانان لەو کاتەدا، ئاشکراشە هەر لەبارەی چاودێری بوون، ئەمەش بەبەڵگەی ئەوە کەهیچ چالاکییەکی دەرەکی نەبوو سەبارەت بەکۆمەڵەکانی ئیسلامی کەلەو کاتدا هەبوون، هیچ حاجییەك ونێرراوێك سەفەریان نەکرد بو دەرەوەی چین دوای نێراوی فاروقی لەساڵی ١٩٣٧ز.

لەمانگی (مایو) ساڵی ١٩٥٣ز یەکەم کۆنگرە بەسترا بۆ موسڵمانانی چین لەپاشان گۆڤارێك دەرچوو بەناوی (موسڵمانانی چین) دوای ساڵێك پەیمانگایەکی ئیسلامی سەربە (کۆمەڵە) دامەزرا ساڵی ١٩٥٥ز بۆ یەکەم جار قورئانی پیرۆز لەچاپ درا بەزمانی عەرەبی لەسەردەمی دوای رزگاربوون.

لەهەمان قوناغدا دەستووری (٥٤) دەرچوو کەجاری سەربەستییەکانی گرتبووە خۆی، لەدەقی (٨٨)ی ماددەکەدا هاتووە بەئازادی بیروڕای ئایینی وەلەم ماوەیەدا موسڵمانان بەشدار بوون لەئەنجومەنی نوێنەرانی گەل واتە پەرلەمان، لەزۆربەی ئەنجومەنە ناوچەییەکاندا بەشداریان هەبوو. دەتوانرێت ئەم ماوەیە تا ساڵی ١٩٥٧ز بەقۆناغێکی خۆماڵی کردن بۆ چالاکییە ئیسلامییەکان لەقەڵەم بدرێت، هەڵسوڕاندنو رێنمایی‌کردن لەکۆمەڵە ناوخۆییەکان گوێزرایەوە بۆ دەسەڵاتداری وڵاتو پارت (الدولة والحزب).



## شۆڕشی رۆشنبیری (الثورة الثقافیة)

لەسەرەتای شەستەکاندا شۆڕشی رۆشنبیری روویدا هەموو ئامانجەکانی ئەم شۆڕشە گۆڕینی رووی چینی ومێژووەکــەی بــوو، وەکــو گەردەلولەیــەك وابــوو کەهــەموو شــتێکی لــەرەگو ریشــەوە هەلکێشـا لەئایینەوە بۆ رۆشنبیری بۆ ئەدەب بۆ خودی مرۆڤ. لەچەمکی ئەم شۆڕشـەدا ئایین وەکو هەموو شتێکی لێهات کەبەهای نـەمێنێت لەلایەن کۆمەلە لاوەکان، هەندێك لەلاوە موسلمانەکان راپێچ کران لەناو هاتو هـاواری خەلکەکــەو گالتــەجاڕیان پــێ دەکــردن، لــە سەرپەرشــتی ئــەم لاوانــەیان نفســیبوو (الشـیاطین) (الاشــباح) (الغیـــلان)، لاوانــی پاســەوانی ســوور مالــەکانیان داگیر کـردن هەرچییـەکیان بەردەسـت بکەوتایە تالانیـان دەکـرد دەیـان سوتاند بەناشـکرا قورئـانی پیرۆزو چەندەها کتـابی تـر سـوتاندیان ، ئەمــەش بەگــەورەترین زیــان دادەنرێــت جونکــە پیاوانی ئایینی ئـەم کتابانـەیان چەندەها سـال بـوو لەلایەن خۆیان پاراستبوو، ئـەم هێرشـانە گەیشـتە مزگەوتـەکان ئەوانــەی لــەدەرەوەی پــەکین بــوون هــەموویان داخـــران، هـــەندێکیان رووخێنـــدران وهەندێکیشـیان کــران بەوەرشــەو کۆگــاو شــوێنی بازرگانی، تەنـها مزگـەوتی (تونـگ سـی ئالو) یـان هێشتەوە کەلە پـەکین بـوو، بۆ ئـەوەی دبلۆمسابیە موسلمانەکان لەجەژنـەکانو مناسـەبەتەکاندا نوێـژی تیادا بکەن.

## جۆرەکانی داپلۆسین (اسالیب القمع)

ئازاردانی لەشـیو دەروونـی هـەموو شـتێك نـەبوو کە موسلمانەکان دەیـان چێژت بـە دەسـتی پاسـەوانی سوور، بەلکو ئـەم ئازاردانانـە جۆراو جۆربـوون، ئـەم داپلۆسینانە گەیشتە ئەو رادەیەی کەدەست درێـژی کرایە سەربیروباوەری موسلمانان وەکو:

★ چــەژنی رەمـــەزانو قوربـــان هـــەلگیرانو قەدەغەکران تا بەرهەم هێنان پەکی نەکەوێت، تەنها ئەو جەژنانەی کەدانی پیانرابوو سەبارەت بەکرێکارە موسلمانەکان، کەدەیانتوانی نەیەنە سەرکار دوو رۆژ بوون لەسالێکدا.

★لـەو ناوچانـەی کەدانیشـتوانی موسـلمانان تیـادا زۆر بـوو قەدەغـە کـرا کەبــەرگی نەتــەوەیی بپۆشـن بەزۆرەملێ دەبا بەرگی رەسمی شین بپۆشن کەبریتی بوو لەپالتۆیەکی داخراوو شەروالێك.

★پالەپەسـتۆیەکی زۆر کرایــە ســەر موســلمانان کەوازبێنن لەدابو نـەریتو ژیانی تایبـەتی خۆیـان، بڕیار درا کەهەر موسلمانێك بمرێت تەنها (١٥) پێ لەقوماشی بەردەکەوێت بۆکفنەکەی ئەمـەش بـەپێی کۆبوونـــە تایبەتیانـــەی کەئـــەم مافـــە دەدات بەموســلمانان لــەکاتی مردنیــان ئەمـــەش لەبــەر مراعـــەتی دابو نـــەریتیان. بـــەلام ســـەرکردایەتی شۆڕشی رۆشنبیری ئەمەی بـەبارێکی قـورس لەقەلـەم دا بـۆ ئـابووری ولات سـەرەڕای ئـەوەی کـەخووەکی کۆنەپەرستانەیەکە دەبێـت وازی لێ بهێنرێت، خـەرج کردنی ئەم کۆبوونانەیان بەتەواوی راگرت.

★بڕیـارێکی تـر شۆڕشـی رۆشـنبیری سـوتاندنی لاشەی مردووە موسلمانەکان بوو، بەهەنجەتی ئەوەی کە گۆڕسـتانی موسـلمانەکان رووبـەرێکی زۆر داگیر دەکات لەزەوی، بەلام کاردانـەوەی ئـەم بڕیارانـە زۆر بـــەتوندو تیـــژی بـــەر پـــەرچ درایـــەوە لەلایـــەن موسلمانەکان کەبووە هۆی راوەستانی وجێ بـەجێ نەکردنی پێشنیارەکە.

★تەنگو چەلەمەی موسلمانان بـەردەوام بـوو بۆ ماوەی (١٠) سال کە تەمـەنی شۆڕشـی رەوشـەنبیرییە کەلەسالی ١٩٦٦ دەستی پێ کردو لەسالی ١٩٧٦ کۆتـایی پێهات.

## قۆناغێکی نوێ (مرحلة جدیدة)

لەناوەڕاستی حـەفتاکاندا رووداوەکان بـەخێرایی یــەك لــەدوای یــەك هــاتن، بەدەســت پێکردنـــی هەولـەکانی (مـاو) بـوو بـۆ گرتنـی جلـەوی شۆڕشـی رۆشـنبیری ودانـانی گەمارۆیـەك بۆچالاکییـــەکانی. لـەدوای مردنـی سـەرۆکی چـین لەسـالی ١٩٧٦ ئـەو کێشانەی کـەڕووی دابـوو بـۆ وەرگرتنـی دەسـەلات



کۆتـایی هـات بەلـەناوچوونی چـوار عەسـابەکە بەسـەرۆکایەتی بێوەژنـی سـەرۆك (مـاو) بریـاردرا ڕووداوەکانی رابـردوو بپێچرێتـەوەو قۆناغێکی نـوێ دەست پێ بکرێت ئەمەش لەساڵی ١٩٧٨ دابوو.

ئەمەش وایکرد کەدان بەئازادی بیروباوەڕی دینی دابـنرێت، بـۆ دابینکردنـی ئەوەکە پیـاوانی ئـایینی خراپەیان لەگەڵدانـەکرێت وەك دەربڕینێك بۆنیـەت چاکی لەلایـەن دەسـەڵاتداری نـوێ لـەدوای مردنـی سەرۆك (ماو) دەسەڵاتی گرتـە دەست. لە ساڵی ١٩٧٦ ماددەیەکی تر زیاد کرا سەبارەت بەیاسای سزادانی ژمـــارە (١٤٧) دەقەکەشـــی ئەمەیـــە: هـــەموو فەرمانبەرێکی حکومی سزادەدرێت بۆمـاوەی دووساڵ کەهـەوڵ بـدات هاووڵاتیـان لـەبیروباوەڕی ئاینیـان دووربخەنـــەوە ومیـــان دابو نەریتـــەکانی کەمـــە نەتەوەییەکان پێشێل بکەن بەجۆرێکی ناشەرعی.

ئەوەمان دێنێتەوە یاد ئەو ئازارانەیکەموسڵمانان گرفتاری ببوون پێش شۆڕش رۆشنبیری (١٩٥٨-١٩٦٦) وەســـەردەمی شۆڕشـــی رۆشـــنبیری (١٩٦٦-١٩٧٦). ســـەرەڕای ئەمـــەش ســـاڵانی پـــاش ســـاڵی ١٩٧٨ لەخۆشـــییەکی رێژەیـــی دادەنرێـــت. ئەمـــەش بەوەرگرتنی چەند (اجراات)تێکی چاك کەپەیمان درا بەکردنەوەی پـەیمانگای ئیسلامی، چاپ کـرد نـەوەی قورئـان پـیرۆز بـۆ جـاری سـێیەم لەسـاڵانی (١٩٤٩)، وەدەرکردنـی گۆفـاری (موسڵمانانی چـین) وەنـاردنی حاجییەکان بۆحـەج کردنـەوەی مزگەوتـەکان، تەنـها لەشاری (سینکیانج) ١٩٠٠ مزگەوت کرایـەوە، دووبـارە جەژنەکانی رەمەزان و قوربانی گێڕدرانەوە.

ئێسـتا زۆر بـەچاکی هـەڵس و کـەوت لەگـەڵ موسڵمانەکان دەکـەن وەپارەیـەکی زۆریـان تـەرخان کراوە بۆ گەورەکردنی مزگەوتەکان وچاکردنەوەیان، هەرموسافرێکی موسڵمان سەر لـەچین بدات یەکسەر دەبینـە لای موسـڵمانەکان و مزگەوتـەکانیان هـەروەها هانی قوتابیانی موسڵمان دەدەن بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەن بەپەیمانگای یەکینی ئیسلامی. هەر چەنـدە کـە تاکە پەیمانگایە لەسەرتاسەری چیندا.

بزووتنـەوەی هـەرەوەزی چـالاکی بەخۆیـەوە دی لـەنێوان جوتیـاران و رەنجبـەرانی موسـڵمان، تالـە ٩٠٪تیان خۆیان ناونووس کرد لەم هەرەوەزییانە، کە هەوڵ دەدات بۆ ژیانێکی باشتر. هەروەها کۆمەڵەکانی هـــەرەوەزی بەرهەمـــهێنان پێکـــهات لـــەناوەندی پیشەسازییەکان، لێرەدا رابوونێکـی گـەورە بـەدی دەکرێـت لـەبواری کانزاکـــان و نـــەفت و ئاســـن و کەرەسەکانی تری رەق. ئێستا لەسەرتاسـەری ولا تـدا موســڵمانەکان قوتابخانـــەی ســـەرەتایی و نـــاوەندی و پەیمانگاو کۆلێژیان هەیە.

زۆربـــەی زۆری موســـڵمانانی چـــین ســـوننین و شوێنکەوتووی ئیمامی حەنـەفین وەرێژەیـەکی زۆر کـەم هەیـە لەشیعەی ئیسـماعیلی کـە رەنگـە (٢٠) هـەزارێك بـن ئیمـام جێی تایبـەتی خـۆی هەیـە لـە کۆمەڵەکانی موسڵمانانی چین، رۆڵی خۆی هەیە کاتی زاروکێـك لـەدایك دەبێـت - یـان یـەکێك ژن بـهێنێت وەکاتێ کەیەکێك دەمرێت.

لەچیندا زیاتر لە (٤٠) هـەزار مزگـەوت هەیـە. کەبەبنکـەی ژیـانی ئـایینی موسـڵمانان دادەنرێـت - هـەندێك مزگـەوت هـەن تایبـەتن بـەئافرەتان بەتایبەتی لەو ناوچانەی کەنەتەوەی موسڵمانی هـۆی تیایدا ئاکنجین.

موسـڵمانان بۆهەریـەك لەمزگەوتـەکانی چـین مۆزەخانەیـەکی شـوێنەواری ئیسـلامییان دانـاوە. زۆربـــەی ئـــەم شـــوێنەوارانە نووســـراون یـــان نەخشەکێشـراون لەسـەر بـەرد. چـەندەها لاپـەڕە لەلاپەڕەکانی‌قورئانی پیرۆز تێدایە کەلەسـەر بـەردی گـەورە نـەخش کـراون یـەکێك لەئیمامـەکان دەڵێـت: کەوا قورئـانی پـیرۆزی لەرابردوودا هەمووی لەسـەر رووی بـەردی گـەورە دەنووسـران، جالەبەرئەمەئێستا دابەش کراون بەسەر مزگەوتەکان.

●



## له پەیمانگای تەکنیکی هەولێر

# بەشی (راگەیاندن)و رۆژنامەگەری کرایەوە

دیمانه / عەدنان حاجی کاکه




دوای راپەرینی گەلی کوردستان و بەرقەرار بوونی ئازادی، بە تایبەتی ئـــازادی رۆژنامەگەری دەیان کەنال و دەزگـــای راگـــەیاندن حـــاجیـــای خوێـــنراوو بیســـتراوو بینراو بە هەموو بیروراکانەوە کەوتنە کـــارو، مـــاوەی (١٠) ساڵیشـــە راگـــەیاندنی کوردی لە نـــاوخۆدا رۆڵـــی بـــەرچاوی دیـــوە، دەتـــوانـــین بڵێـــین لـــە خورهـــەلاتی ناوەراستدا ئازادی رۆژنامەگەری وەکو کوردستان بەرچاو ناچێ، هەر لە ســـەرەتای دەرچوونی رۆژنامـــەکان و کەناڵـــەکانی دیکـــە، لە لایـــەن رۆژنامەنووسـانەوە دوو خەونی گەورە دەبینران یەکێکیان سەندیکایەکی رۆژنامەنووسان بـــۆ داکۆکیکـــردن لە مافەکانیان، دووەمیان پەیمانگەیەك یا کۆلێژی رۆژنامەگەری بوو، بـــێ گومـــان ئەوەش لە سایەی پەرلـــەمان و حکومـــەتی کوردســـتانەوە ئـــەو خەونانـــە بوونـــە واقیـــع، پەرلەمانی کوردستان یاسای دامەزراندنی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانی دەرکردو، دوای ئـــەوەی ســـەندیکاش دامەزرا، داوای یەکەمی لە پەرلەمان ئەوە بوو، ئەکادیمیایەکی رۆژنامەگەری بکریتەوە، ئـــەوەبوو لـــەکۆتایی ســـاڵی رابردوودا حکومەتی کوردستان و ئەنجوومەنی خوێندنی باڵا رەزامەندییان نیشاندا بۆ کردنەوەی ئەو بەشـــە کـــە داوای گشت رۆژنامەنووسێکی کوردە لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستاندا.

بۆ ئەم مەبەستە (خۆری ئیسلام) لە دیمانەیەکدا، لەگەڵ بەرێز مامۆســـتا فازل نەبی عوسمان راگری پـــەیمانگای تەکنیکی هەولێر سازدا:

*** سەبارەت بە یەکەم هـــەنگاوی کردنـــەوەی بەشـــی راگـــەیاندن لـــە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر وتـــی:**

- وەکو پێویستییەکی ســـەردەم رۆژنامەنووسانی کوردستان لەسەر لاپـــەرەی رۆژنامـــەکان و شاشـــەی



تەلەفزیۆنـــەکان و میکرۆفۆنـــی رادیۆکـــان هەمیشـــە داوای کـــارێکی وایاندەکرد بۆیـــان ساز بکرێـــت، بـــۆ ئـــــەوەش دوای لێکۆڵینـــــەوەو گفتوگۆیەکی زۆر لە راوێژکاریـــەتی خوێندنـــی بـــالا لـــە ئەنجوومـــەنی وەزیـــران گەیشـــتنە ئـــەوەی، بـــەڵێ دەبـــێ، بەشـــێکی رۆژنامەگـــەری بکرێتـــەوە، بـــۆ ئـــەوەش وا پێشـــنیار کـــرا لـــە کۆلێـــژی ئـــادابی زانکـــۆی






فەرهاد قادر نۆمەر

لەگۆڤاری (خۆری ئیسلام)دا، ژمارە (٢) کاك مەحەمەد فەتحوللا وتارێکی بەناو نیشانی (مەلاعاسی) بلاو کردبوۆوە. نووسەر لەوتارەکەیدا هەندێك لایەنی مێژووی ژیانی مەلا عاسی باس کردووە لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکی. لەنووسینەکەیدا باسی لەهەڵوێستی بوێرانەو چاو نەترسانەی ئەو کەڵەشاعیرە دەکات، چۆن لە رۆژگارێکی پڕ لەنەهامەتی و تۆقاندن بەشیعرە ئاگرینەکانی قەڵغانێکی کاریگەر بووە دژ بەزوڵمو زۆرداری حوکمڕانەکانی سەردەمو باکی پێیان نەبووە، بەڵام بڕێك لە زانیارییەکانی دەربارەی ئەم شاعیرە بەدوا داچوون هەڵدەگرن، لەبارەی ناووبنەچەی شاعیر نووسەر دەڵێ: (عاسی ناوی مستەفایە کوڕی مەلا حەمەدەمینە، بەڵام بەداخەوە بەڕێزیان بەهەڵەداچوو بوو)، لەڕاستیدا عاسی شاعیر ناوی: مەلا مستەفای کوڕی مەلا رەسوڵی کوڕی مەحەمەدی کوڕی عوسمانە. لەمەڕ ساڵی لەدایك بوونی، نووسەر دەڵێ: (لەساڵی ١٨٩٠ لەشاری کۆیەی هونەرمەندو شاعیران چاوی بەژیان هەڵهێناوە)، بەڵام دیارە نووسەر لەلێکدانەوەو گۆڕینی ساڵی کۆچی بۆ ساڵی زایینی بەهەڵەداچووە، کەڕاستییەکەی لەساڵی ١٣١٠ك لەدایك بووە، کەبەرامبەرە بەساڵی ١٨٩٢ زایینی. نووسەر بەوەندەش نەوەستاوەو بەردەوام بووە لەهەڵەکانیدا کەدەڵێ: (بەمەبەستی خوێندنی ئایینو قورئانی پیرۆز گەلێ ناوچەی کوردستان گەڕاوە، پاشان خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە) لێرەدا رووی پرسیار لەنووسەر دەکەمو ، پێی دەڵێم: نازانم عاسی شاعیر لای کام زانای بەناوبانگ خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە؟!

بەڵێ راستە عاسی شاعیر بۆخوێندن گەلێ شوێنیو ناوچەی جیا جیا لەکوردستان گەڕاوەو، لەلای چەندان زانای بەناوبانگو ناوداری وەك (میر مەحەمەدی کاکەشین) دەرسی خوێندووە. بەڵام نەیتوانیوە خوێندنی تەواو بکاتوئیجازەی مەلایەتی وەربگرێت، کەچی تابڵێی شارەزاو زانا بووە، گەلێ کتێبی بەسوودو بەکەڵکی خوێندونەتەوەو لەدێی (بانە گولان)و (شێواشۆك) بەکاروباری مەلایەتی هەڵساوە. دواجار دەڵێم: پێویستە نووسەرانی ئێمەش ئەوە پەیڕەوبکەن کەلە زۆربەی وڵاتاندا کراوە بەرێباز، ئەویش پەیڕەوی نووسین پیشانی هاودڵو هاوکاری خۆدانە، بۆ ئەوەی کەڵێنی پڕ بکرێتەوەو پێش چاپ تێبینی لەسەر بدرێتو باسەکە لەزۆر لایەنەوە تەواو بنوێنێت. ئەمە ئەو چەند سەرنجە بوو لەسەر نووسینەکە، هیوادارم منیش وەك کاك مەحەمەد فەتحوللا خزمەتێکم بەئەدەبی کوردی کردبێت

---

سەرچاوەکان:

١. گۆڤاری (کاروان) ژ. (٥٧) ساڵی ١٩٨٧.
٢. هەندێك سەرچاوەی جیاجیای وەك گۆڤاری بەیان



هەولێر .... مەکۆی پیرۆزی ئایین و خەڵوەتی سوڵتان موزەفەر و شێخەڵڵا و شێخی چۆلی